تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

زنجيرەی ئیسلام و لاوان

(٣)

# لەگەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟

## مَنْ تُجالِس وَمَنْ تُصاحِب ؟



نووسینی : عبدالله علي الجعيش

وەرگێڕانی : مامۆستا محمد عبدالرحمن لطيف

وتارخوێنی مزگەوتی (شێخ ابراهیم / کەلار)

چاپی حەوتەم

زنجیرەی ئیسلام و لاوان
(٣)

# لە گەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟

## مَنْ تُجالِس ومَنْ تُصاحِب ؟

نووسینی : عبد الله علي الجعيش

وەرگێڕانی : مامۆستا محمد عبد الرحمن لطيف
مزگەوتی (شێخ إبراهيم) / کەلار

چاپی حەوتەم
١٤٣١ کۆچی

ناوی نامیلکە : لە گەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت؟

ناوی نووسەر : عبد الله علي الـجعيش .

ناوی وەرگێڕ : مامۆستا محمد عبد الرحمن لطيف .

زنجیرە : زنجیرەی (٣) سێیەم لە (زنجیرەی ئیسلام و لاوان) .

ژمارەی سپاردن : ژمارە (٥٠٣)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری حوکومەتی هەرێمی کوردستانی پێدراوە .

نۆرەی چاپ : حەوتەم .

ساڵی چاپ : ١٤٣١ ك ـ ٢٠١٠ .

چاپخانە : چاپەمەنی سیڤا ـ سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی .

بنکەی بڵاوکردنەوە :

کتێبخانەی سوننە ـــ سلێمانی .

کتێبخانەی پێشین ـ هەولێر .

کتێبخانەی زانستی بەسوود ـ کەلار .

کتێبخانەی سیما ـ چەمچەماڵ .

**لە بڵاوکراوەکانی**

**کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار**

﴿ نرخی ئەم نامیلکەیە بە کۆ (٧٥٠) دینارە ﴾

## پێشەكی چاپی دووەم



سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار (یەك مانگ) تێپەڕ نەبوو بە سەر چاپی یەكەمی ئەم نامیلكەیەدا هەموو نوسخەكانی تەواو بوون و داواكارییەكی زۆریشی لە سەرە ...

دەتوانم بڵێم : هۆی سەرەكی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێك ، لەوانە :

١ ـ گرنگی نووسراوەكە ، چونكە باس لە بابەتەكی واقعی و زیندوو و پێویستی ڕۆژگاری ئێستا دەكات .

٢ ـ سادەیی شێوازی داڕشتن و بەردەست خستنی زانیارییەكان بۆ لاوانی ئەمڕۆ كە بە ئاسانترین شێوە بتوانن لێی تێبگەن و پێی سوودمەند ببن ، چونكە بەڕاستی وشە و زاراوەی زل و ڕەوەنەقداری بێ ناوەڕۆك مێشكی زۆربەی لاوانی ئەمڕۆی ماندوو كردووە .

٣ ـ خوێندنەوەی ئەم نامیلكەیە و هاوشێوازەكانی هێز و توانایەك دەبەخشێت بە لاوانی ڕۆژگاری ئێستا كە لە بۆشاییەكی ڕۆحی و حاڵەتێكی دەروونی ناهەموواردا دەژین ، بەڕاستی دیاری كردنی هۆكارەكانی ئەم حاڵەتە و دەستنیشان كردنی ڕێگاكانی چارەسەر دەبێتە مایەی پڕ كردنەوە و چارەسەكردنی ئەو بۆشاییە ڕۆحی و حاڵەتە دەروونییە ناهەموارە ، ناوەڕۆكی ئەم نامیلكەیەش هەوڵێكی

دڵسۆزانە بوو لەم بوارەدا .

پێم باشە لێرەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك بدەم :

١ - لەم چاپە نوێیەدا بە هاوکاری و پێداچوونەوە و تێبینی چەند برا و خوشکێکی بەڕێز هەڵە چاپییەکانی چاپی یەکەمی ئەم وەرگێڕانە ڕاستکرانەوە ، داواکارم خوای گەورە پاداشتی هەموویان بە چاکە بداتەوە و نموونەیان زۆر بکات و ئەو هەوڵە دڵسۆزانانەیان بکاتە صەدەقەیەکی بەردەوام بۆ قەبر و قیامەتیان .

٢ - هەندێك لە خوێنەرانی ئەم زنجیرەیە (**لەگەڵ کێدا دادەنیشێت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟**) و زنجیرەکەی پێشوویش (**برای لاوم چۆن بەرەنگاری ئارەزوو دەبیتەوە ؟**) :

پرسیاریان دەکرد سەبارەت بەوەی ئایا بۆ چی تەنها باسی (برا) و (برایەتی) و (برایان) دەکرێت ؟ ئەی بۆ باسی (خوشك) و (خوشکایەتی) و (خوشکان) ناکرێت ؟

لە وەڵامدا دەڵێم : ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەوا ئێمە خوشکانی بە ئیمان و حەیا و حیشمەت پەراوێز دەخەین !

نەخێر هەرگیز وانییە و هەر کەسێکیش وا تێبگات ئەوا زۆر بە هەڵەدا چووە !

لەبەر ئەمە لە کتێبی (**برایەتی نێوان موسڵمانان**)دا لە پەراوێزی لاپەڕە (٤)دا ئاماژەم بە هۆکاری ئەمە داوە و نووسیومە :

پێویستە ئەوە بزانرێت كە ئەم بابەتە (**برایەتی**) و هاوشێوازەكانی تەنها تایبەت نییە بە پیاوانی موسڵمانەوە ، بەڵكو ئافرەتان و خوشكانی موسڵمانیش دەگرێتەوە چونكە (برایەتی لە نێوان پیاواندا - خوشكایەتی لە نێوان ئافرەتاندا) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((إنَّمـا النساء شقائق الرجال)) [صحيح سنن أبـي داود رقم : (٢١٦)] .

واتە : ئافرەتان هاوشان و لە ڕیزی پیاوان دان .

لەمەوە ئەوە تێدەگەین كە هەر ئایەت و فەرموودەیەك فەرمانی تێدا بوو بۆ پیاوان یان باسی پیاوانی دەكرد ئەوا ئافرەتانیش دەگرێتەوە .

قال الـحافظ ابن حجر فـي "فتح الباري شرح صحيح البخاري":

(إِنَّمَا خُصَّ الذَّكَرُ بِالذِّكْرِ لِكَوْنِ الرِّجَالِ فِي الْغَالِبِ هُـمُ الْمُخَـاطَبُونَ وَالنِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ فِي الْأَحْكَامِ إِلَّا مَا خُصَّ)* .

واتە : بەڕاستی لەبەر ئەوە بە تایبەت باسی ڕەگەزی نێر كراوە چونكە زۆربەی جار گوفتار ڕووبەڕووی پیاوان كراوەتەوە و ئافرەتانیش لە باسی ئەحكامەكانی شەرعدا هاوشانن و لە ڕیزی پیاوان دان ئیللا لەو حوكمانەدا نەبێت كەوا تایبەتن بە پیاوانەوە .

خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ

* فتح الباري : (١ / ٣٣٣) ، وانـظر : (٦ / ٧٤٠) منهُ أيضاً .

ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ [سورة التوبة] .

واتە : ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکی تریانن ، هەموویان فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە و نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن ، ئەوانە خوا ڕەحمیان پێدەکات ، بەڕاستی خوا بەدەسەڵات و دانایە .

٣ ـ سەبارەت بە (پێکەوە دانیشتن و هاوڕێیەتی و پەیوەندی نێوان کوڕان و کچان) کە لەم نامیلکەیەدا ئاماژەی بۆ نەکراوە و بابەتێکی زۆر هەستیار و پێویست و زیندوویشە بە پشتیوانی خوای گەورە لە زنجیرەی داهاتوودا دەیخەینە بەر لێکۆڵینەوە و لە ژێر ناونیشانی (**هاوڕێیەتی و پەیوەندی نێوان کوڕان و کچان**)دا چاپ دەکرێت (إنْ شاءَ اللهُ) .

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا دووبارە سوپاس و ستایشی خوای زانا و دانا دەکەم و داوای لێدەکەم کە ئەم هەوڵە کەمەم بە پاکی لێ قەبوڵ بکات و بیکاتە تێشوویەك بۆ قەبر و قیامەتم ..

وەرگێڕ : محمد عبد الرحمن لطيف

(کەلار : ٢٤ / ٤ / ١٤٢٩ ك ـ ٢٩ / ٥ / ٢٠٠٨)

(٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٢)

# پێشەکی نووسەر



الحمد لله رب العالمين ، وصلى الله وسلم على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آلــهِ وصحبهِ أجمعين .

أمـــا بعد :

ئــەم نوســراوە چــەند لاپەڕەیەکــە کۆمکرابوونەتــەوە لــە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ، وە لـە ووتـەی زانایان و دلنایان سەبارەت بە هانـدان بـۆ هەڵبـژاردنی هـاوڕێ و بـرادەری صـالح و چاك ، وە سـەبارەت بـە ووریـا کردنـەوە و ئاگـادار کردنـەوە لـە هـاوڕێ و بـرادەری خـراپ ، لـە گـەڵ ڕوون کردنـەوەی بەرهـەم و شوێنەواری ئەم و ئەویش .

هیچ هەوڵ و تێکۆشانی منی تێدا نی یە جگە لـە هەڵبـژاردن و بەنـد کـردن و کۆکردنـەوەی نـەبێت لـە جێگایەکـدا ، بـۆ ئـەوەی بکەوێتــە بــەر چــاوی برایــانی خــوایم لــە گەنجــە بــە هیــوا و ئومێدمەندەکان .

برا و خوشکی گەنج :

ئەم ووتە و حیکمەتانە بکە بە چرایەك ڕووناکی لێوە وەربگریت ، وە نەکەیت هەڵبژاردنی هاوڕێکەت بەند بێت بە خۆشەویستی سروشتیەوە یان بە هەوا و ئارەزووەوە یان بە (مِزاج)وە ، چونکە چەندین مرۆڤ هەیە خۆپاریزی دەکات لە خواردەمەنیەك کە حەزی لێدەکات یان لە ئارەزوویەك کە دەروون و نەفسی بۆی دەڕوانێت ئەمەش لە ترسی ئەو ئەنجامەی کە لێی دەکەوێتەوە چ ئێستا بێت یان لە داهاتوودا .

وە لە بەبرت نەچێت بپارێرەوە بۆ برای موحتاجت پاڕانەوەیەکی نهێنی کە خوا سوودەکەی بگەیەنێت بە ئەو و بە تۆش .

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته .

عبد الله بن علي الجُعيش
القصيم ـــ بريدة ـــ كلية الشريعة



الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على مَـنْ بعثه الله رحمـةً للعالمين ، وعلى آلــهِ وصحبهِ أجمعين.

وبعد :

خوای پاك و پایە بەرز مەبەستی خۆی لە دروست كردنی جنۆكە و مرۆڤ دیاری كردووە ئەویش : پەرستنی خوایە بە تەنها بە بێ شەریك و هاوەڵبڕیاردان بۆی ، وەك فەرموویەتی : ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ [سورة الذاريات] .

واتە : خوا جنۆكە و مرۆڤــی دروست نەكردووە تەنها بۆ یەك مەبەست نەبێت ئەویش پەرستنی خوایە بە تاك و تەنها و بێ شەریك و هاوەڵبڕیاردان بۆی .

وە فەرموویــەتی : ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴿٣٦﴾﴾ [سورة النحل] .

واتــە : ئێمــە بـۆ هــەموو ئوممــەت و قــەوم و كۆمەڵـە خـەڵكێك پێغەمبەرێكمان ناردووە بۆ ئەوەی : خوا بە تەنها بپەرستن و دوور بكەونەوە لە طاغوت و ئەولنەی كە جگە لە خوا دەپەرسترێن .

وە فەرموویەتی : ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾ [سورة الملك] .

واتە : گەورەیی و پایە بەرزی بۆ ئەو خوایەی کە مولکی بە دەستە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە ، ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی دروست کردووە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە تا دەربکەوێت کامتان کردەوەتان چاکترە ، وە ئەو خوایە توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە و لێبوردەشە بۆ تاوانباران .

وە جگە لەمانەش چەندین ئایەتی تر هەن کە بەڵگەن لە سەر دیاری کردنی ئامانج و مەبەست لە دروست کردنی خەڵك کە ئەویش پەرستنی خوایە بە تاك و تەنها و بێ شەریك .

وە دڵنیایەتی و حیکمەتی خوا لە دروستکراوەکانیدا وا دەخوازێت کە مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەز لە تێکەڵاوی کەسانی تر بکات و لەگەڵیاندا دانیشێت و کۆببێتەوە .

وە ئەم دانیشتن و هاوڕێیەتییە شوێنەوار و پاشماوەی ڕوون و ئاشکرای هەیە لە سەر بۆچوون و ڕێباز و ڕەوشت و ئاکاری مرۆڤ ، وە هۆکارێکی کاریگەرە بۆ دیاری کردنی پاشە ڕۆژ و داهاتووی مرۆڤ و بەختەوەری دونیا و دوا ڕۆژی .

چونکە مرۆڤ کاریگەر دەبێت و چاو لە هاوەمەجلیس و هـاوڕێی دەکات لە بۆچوون و بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و کردەوەکانیـدا ، وە ئەم چاو لێکردنەش لە ناخ و لە سەر جەستە و بۆچوون و ڕەوشت و کردەوەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە .

وە شەرع و عەقڵ و واقیع و ئەزمون (التجربة) و بینینیش هـەموو بەڵگەن لە سەر ئەم ڕاستیە .

جا لە بەڵگەکانی شەرع : ئەو هەواڵەیە کە خوای پاك و بێ عـەیب بۆمان باس دەکات سەبارەت بە پەشیمان بوونەوەی ستەمکار ـ زاڵم لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەر هاوڕێیەتی کردنی لە گەڵ کەسانێکی گومڕا و لادەر لە ڕێگای ڕاست کە بوونەتە هۆکاری گومڕا بوونی، خوای پایە بەرز دەفەرموێت : ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي ۗ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنْسَانِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ [سورة الفرقان] .

واتە : لە ڕۆژی قیامەتدا ستەمکار و زاڵم لە پەشیمانیدا قـەپ دەکـات بـە هـەردوو دەسـتیدا و دەڵێـت : خۆزگـە ڕێگـا و ڕێبـازی پێغەمبەرم (ﷺ) بگرتبایەتە بەر ، وە نەمان بۆ خـۆم خۆزگایە فڵانە کەسم نەکردایە بە هاوڕێی خۆم چونکە ئەو گومڕای کردم و ڕێگای

یادکردنی خوای لە بیر بردمەوە دوای ئەوەی کە هات بۆ لام و بوو بە هاوڕێم ، وە شەیتان بەردەوام مرۆڤ لە خشتە دەبات و دەیخلسکێنێت .

ئیمامی (ابن جرير الطبري)[1] لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی :

( لە ڕۆژی قیامەتدا ستەمکار و هاویەش پەیداکەر لە پەشیمانیدا قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیدا لە سەر ئەو کەمتەرخەمی‌یەی کە کردوویەتی دەرحەق بە خوا ، و خۆی لە ناو بردووە و فەوتاندوویەتی بە کوفر کردن لە پێناو گوێڕایەڵی کردنی هاوڕێ و برادەرەکەیدا کە ڕێگری لێ دەکرد لە سەر ڕێگای ڕاستی خوا ، وە دەڵێت : خۆزگایە لە دونیادا ڕێگای پێغەمبەرم (ﷺ) بگرتبایەتە بەر .. واتە : ڕێگای ڕزگاری لە سزای خوا).

وە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي﴾ هەواڵی پەشیمانی ئەو کەسەمان بۆ باس دەکات لە سەر ئەوەی کە پێشتر لە دونیادا کردوویەتی لە تاوان کردن دەرحەق بە خوا لە پێناو گوێڕایەڵی کردنی هاوڕێکەی : واتە : (گومڕای کردم و لای دام لە ڕێگای ئیمان و قورئان دوای ئەوەی کە هات بۆلام و بوو بە

[1] تفسير الطبري : (١٩ / ٧) .

هاوڕێم و ڕێگری لێ کردم لە سەر ڕێگای خوا)[٢].

هەروەها خوای پاك و پایەبەرز فەرموویەتی : ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ [سورة الزخرف] .

واتە : برادەران لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێکیان دوژمنی هەندێکیانن تەنها کەسانی لە خوا ترس و خۆپارێزەر لە تاوان نەبێت .

---

[٢] ئیمامی (السیوطي) لە تەفسیرەکەیدا (٦ / ٢٥٠) لە (ابن عباس) ەوە (أثـــر)ێك دەگێڕێتەوە و (سند)ەکەشی بە (صحیح) داناوە ، ئەمەش لە ڕوونکردنەوەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەدا ، کە بە هۆی (عقبة بن أبي معیط)ەوە دابەزیوە لە کاتێکدا کە موسوڵمان بوو ئەنجا هەڵگەڕایەوە و وازی لە ئیسلام هێنا لە بەر خاتری هاوڕێیەکی کافر و بێباوەڕی کە لەو کاتەدا لە شام بوو ، ئەنجا کە برادەرەکەی گەڕایەوە و ئامادە بوو تووڕە بوو لە (عقبـــة) ، جا ئەویش کوفری کرد و هەڵگەڕایەوە لە ئیسلام لە بەر خاتری ئەو هاوڕێ کافر و مل هوڕەی.

بەڵام لە گەڵ ئەمەشدا لە (علم الأصول)دا ئەوە سەلمێنراوە : (إنّ العبـــرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) واتە : عیبرەت بە گشتێتی لەفزی ئایەتەکەیە نەك بە تایبەتمەندێتی هۆکاری دابەزینەکەی .

بۆیە ئیمامی (ابن کثیر) فەرموویەتی : (جا چ ئەم ئایەتە هۆی دابەزینی (عقبة بن أبي معیط) بێت یان غەیری ئەو لە بەد بەخت و خەسارۆمەندان : ئەوا گشتییە بۆ هەموو ستەمکار و زاڵمان) تفسیر ابن کثیر : (٦ / ١١٦) .

جا بــرادەران و هــاوەڵان لــە ســەر غــەیری گوێڕایــەڵی بــۆ خــوا هەندێکیان دوژمنی هەنـدێکیانن لـە ڕۆژی قیامەتـدا ، وە سەرچـاوە و هۆکـاری ئـــەم دوژمنایەتییـــە بریتییـــە لـــەوەی کـــە هەنـــدێکیان یارمەتیدەری هەندێکی تریان بووە لە سەر ناحەقی ، و بانگەواز کاری بووە بۆ لارێبوون و گومڕایی .

بەڵام برادەرە لە خوا ترسەکان ئەوانەی کە خۆیـان دەپـارێزن لـە تاوان ئەوا خۆشەویستی هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان لە ڕۆژی دوایـدا بـەهێز تـرە لـە خۆشەویـستی دونیـا ، ئەمـەش لـە بـەر ئەوەیـە کـە هەندێکیان یارمەتیدەری هەندێکی تریان بوون بۆ کاری خێر و چاکە ، وە هانـدەری یـەکتر بـوون بـۆ گوێڕایـەڵی خـوا و پێغەمبـەر (ﷺ) ، وە یەکتریان ووریا و ئاگادار دەکردەوە لە خراپە و خراپەکاری .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی : ((إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ : كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْـذِيَكَ ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً ، وَنَافِخُ الْكِـيرِ إِمَّـا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً))[٣].

واتە : نموونەی هاوەڵی چاک و هاوەڵی خراپ : وەکو

---

[٣] صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) من حديث أبـي موسى ، واللفظ المـذكور لـمسلم .

هەڵگری بـۆنـی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فووکار بە کوورەدا وایە ، جا هەڵگری بـۆنی میسك یـان لـەو بۆنـەت پـێدەبەخشێت یان لـێی دەکڕیت یان بۆنی خۆشی لێهەڵدەمژیت ، بەڵام فووکار بە کوورەدا یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێهەڵدەمژیت .

پێغەمبەر (ﷺ) ـ لەم فەرموودەیەدا ـ ئـەوەی ڕوون کردووەتـەوە کـە هاومـەجلیس و برادەر کاریگـەری هەیـە لـە سـەر هاومـەجلیس و برادەرەکەی بە خراپە یان بە چاکە ؛ بە پـێی چاکێتی و گەندەڵێتی ئەو کەسە ، دەبینیت هاوڕێی چاکی شوبهاندووە بـە هـەڵگری بـۆنـی میسك (واتە بـۆن فـرۆش) چـونکە ئەگـەر تـۆ لـە گەڵیدا دانیشتیت و هاوڕێیـەتییت کـرد ئـەوا بـێ گومـان لـەوەوە یـەکێك لـەم سـێ شـتەت دەست دەکەوێت :

یان لەو بۆنەت پـێدەبەخشێت ، یان لـێی دەکڕیت ،

یان بە لایەنی کەمەوە بۆنی خۆشی لێهەڵدەمژیت کە کاریگـەری هەیە بۆ سـەر دەروون و لاشـە و جلـەکانت ؛ هـەروەها هاومـەجلیس و برادەری چاك بێ گومان سوودی لێدەبینیت و سـوودمەند دەبیـت بـە دانیشتن لە گەڵیدا ، وەك چۆن دوای کـەمێکی تـر باسـی سـوودەکانی دانیشتن و هاوڕێیەتی کردنی چاکەکاران و خێرخوازان دەکەم .

هـەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) هاومەجلیسی خراپـی شـوبهاندووە بـە فووکـار بـە کـوورەدا ، ئەمـە یـان بڵێسـەی ئاگرەکـەی بـەرز و بـڵاو

دەبێتەوە و دێت بە سەرتا و جلەكانت دەسووتێنێت ، یان بە لایەنی كەمەوە بۆنی پیسی لێدەبینیت كە بەر لاشە و جلەكەت دەكەوێت ، هەروەها هاوڕێی خراپ بێ گومان زەرەرمەند دەبیت بە دانیشتن لەگەڵیدا ، وەك چۆن بە ووردی باسەكەی دێت .

(النووي) ڕەحمەتی خوای لێبێت سەبارەت بەم فەرموودەیە فەرموویەتی : (فِيهِ فَضِيلَةُ مُجَالَسَةِ الصَّالِحِينَ وَأَهْلِ الْخَيْرِ وَالْمُرُوءَةِ وَمَكَارِمِ الْأَخْلَاقِ وَالْوَرَعِ وَالْعِلْمِ وَالْأَدَبِ ، وَالنَّهْيِ عَنْ مُجَالَسَةِ أَهْلِ الشَّرِّ وَأَهْلِ الْبِدَعِ وَمَنْ يَغْتَابُ النَّاسَ أَوْ يَكْثُرُ فُجْرُهُ وَبَطَالَتُهُ وَنَحْوِ ذَلِكَ مِنَ الْأَنْوَاعِ الْمَذْمُومَةِ)[1].

واتە : ئەم فەرموودەیە ئەوەی تێدایە كە : هاوڕێیەتی كردن و دانیشتن لەگەڵ پیاوچاكان و خێرخوازان و كەسانی خاوەن كەسایەتی و پیاوەتی و ڕەوشت پیرۆز و خۆپارێز لەوەی كە ترسی قیامەتی لە سەرە و خاوەن زانست و بە ئەدەب كارێكی چاك و فەرمان پێكراوە ، هەروەها قەدەغەكردنی هاوڕێیەتی كردن و دانیشتنی تێدایە لەگەڵ خراپەكاران و بیدعەچییەكان و ئەوانەی كە غەیبەتی خەڵك دەكەن یان ئەوانەی كە تاوان زۆر دەكەن و بێ كارن و هاوشێوەی ئەمانە لە جۆرە زەمكراوەكان .

---

[1] شرح صحيح مسلم : (١٦ / ١٧٨) .

وە (ابن حجر)یش ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (وَفِـي الْحَدِيث النَّهْيُ عَنْ مُجَالَسَة مَنْ يُتَأَذَّى بِمُجَالَسَته فِـي الـدِّين وَالـدُّنْيَا ، وَالتَّرْغِيب فِي مُجَالَسَة مِنْ يُنْتَفَع بِمُجَالَسَته فِيهِمَا)(*).

واتــە : ئــەم فەرموودەیــە قەدەغــەکردنی هاوڕێیــەتی کــردن و دانیشتنی تێدایە لەگەڵ ئەو کەسـەی کە زەرەرمەنـد و تووشـی ئـازار دەبێت لە دانیـشتن لەگەڵیدا لـە بـواری دیـن و دونیـادا ، وە هانـدانی تێدایـە بـۆ هاوڕێیـەتی کـردن و دانیـشتن لەگـەڵ ئـەو کەسـەی کـە سوودمەند دەبێت لە دانیشتن لەگەڵیدا لە هەردوو بوارەکەدا .

وە (السعدي)یش ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

(پێغەمبــەر (ﷺ) دوو نموونــەی هێناوەتــەوە و ئــەوەی ڕوون کردووەتەوە کەوا هاوڕێ و برادەری چاك تۆ لـە هـەموو حاڵەتێکدا لـە گەڵی لە دەسکەوت و خێردا دەبیت ، وەك هەڵگری بۆنـی میسك کە سوود دەبنێت لەو میسکەی کە پێیەتی ، یان بە پێتبەخشێ یان بە بەرامبەر ، وە کەمترینی ئەمانە ماوەی دانیـشتنتە لـە گەڵیدا کە تـۆ دەروونت ئاسـودە دەبێـت بـە بـۆنی میـسکەکە ، جـا ئـەو خێـرەی کـە تووشی بەندە دەبێت لە هاوڕێ و برادەری چاکەوە بەهێزتر و چاکترە لـە میـسکی زۆر چـاك ، چـونکە یـان ئـەوەت فێردەکـات کـە سـوودی

(*) فتح الباري : (٤ / ٣٢٤) .

لێدەبینیت بۆ دین و دونیات ، یان ئامۆژگاریەکت پێشکەش دەکات ، یان وریا و ئاگادارت دەکاتەوە لە مانەوە لە سەر ئەوەی زیان و زەرەرت پێدەگەیەنێت ، هاوڕێ و برادەری چاك هانت دەدات بۆ گوێڕایەڵی خوای گەورە و چاکەکاری لەگەڵ باوك و دایك و گەیاندنی پەیوەنـدی خزمایـەتی ، وە بەرچـاوت ڕۆشـن دەکاتـەوە و کەموکوڕیەکانی خۆتت پیشان دەدات ، وە بانگەوازت دەکات بۆ ڕەوشتە پیرۆز و باشەکان بە گوفتار و کردار و حاڵ و ئاکاری ، چونکە مرۆڤ ڕامێنراوە لە سەر چاولێکردنی هاوڕێ و ئەو کەسەی کە لە گەڵیدا دادەنیشێت ، تەبیعەت و دەروونەکان هۆگری یەکترن ، هەندێکیان ئەوی تریان دەبات بەرەو خێر یان بەرەو دژەکەی ، وە کەمترین شتێك سوودی لێببینیت لە هاوڕێ و برادەری چاك ـ کە سوودێکە سوکایەتی پێناکرێت ـ ئەوەیە کە بە هۆیەوە خۆت دەگریتەوە لە خراپەکاری و تاوانەکان ، لە بەر ئاگابوون لە خاتری برادەرێتی ، وە لە بەر پێشبڕکێ کردن لە کاری خێر و چاکەدا ، وە بۆ خۆبەرز ڕاگرتن لە خراپە و خراپەکاری ، وە بۆ ئەوەی پارێزگاریت لێبکات لە کاتی ئامادەبوونت و نادیاریتدا ، وە بۆ ئەوەی سوودمەند ببێت بە خۆشەویستی و دوعای خێری بۆت لە کاتی ژیانتدا و لە دوای مردنیشت ، وە بۆ ئەوەی بەرگریت لێبکات بە هۆی پەیوەندی پێ کردن و خۆشەویستیەوە بۆت ، کە ئەمانە شتانێکن خۆت ناتوانیت

ڕاستەوخۆ بەرپەرچیان بدەیتەوە ، هەروەها هـاوڕێ و بـرادەری چـاک هەندێك جار دەتگەیەنێت بـە کەسانێك و کارلێکەوە کـە پەیوەنـدی کردنت پێیانـەوە سـوودت پێدەگەیـەنێت ...) تـا کۆتـایی ووتەکـەی ڕەحمەتی خوای پایەبەرزی لێبێت[٦] .

وە لەم دێڕانەی کە دێن هەندێك بە ووردی باسی هـاوڕێ و بـرادەر و کاریگـەریی بـە خراپـە یـان بـە چـاکە دەکـەم ، باسـی هەنـدێك لـەو بەرهەمانە دەکەم کە دەستت دەکەوێت لە هاوڕێ و برادەری چاکەوە ، وە باسی ئەوەش دەکەم کە هاوەڵ و برادەری چاك چەند کاریگەری خێر و باشی هەیە بە سەر مرۆڤەوە لە دونیا و دوارۆژدا ، وە لـە پـاش ئەمەشـدا باسـی فـەزڵ و گـەورەیی خۆشەویـستی لـە بـەر خـوا و کاریگەرییەکـەی دەکـەم ، ئـەنجا باسـی هەنـدێك لـە بەرهەمـەکانی مەجلیسگێڕان و دانیشتن لەگـەڵ کەسـانی خراپـەکار و گەندەڵکارانـدا دەکەم ، وە باسی ئەوەش دەکەم کە مەجلیسگێڕان و دانیشتن لەگەڵ ئـەم کەسـانەدا چـەند زیـان و زەرەری لێدەکەوێتـەوە و مرۆڤ بـەرەو تیاچوون دەبات ، ئـەنجا کۆتـایی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە دێنم بـە باسـی هەندێك لەو وتانەی کە لە پێشینەوە گێڕدراونەتەوە بۆمـان سـەبارەت بە هاندان بۆ هەڵبژاردنی هاوەڵ و برادەری چاك .

---

[٦] بـهجة قلوب الأبرار ـــ الـحديث الثامن والستون .

وە گومانی تێدا نی‌یە کەوا خەڵك لە نێوان خۆیاندا جیاوازن ، هەندێکیان کلیلی خێر و چاکەیە و ڕێنماییکارە بۆی ، وە هەندێکیان کلیلی خراپەیە و دەیهێنێتە ڕێی ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ ، وَإِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ))[٧].

واتە : بەڕاستی لە نێو خەڵکدا کەسانێك هەن کلیلی کردنەوەی خێر و چاکەن و داخەری خراپەن ، وە بەڕاستی لە نێو خەڵکدا کەسانێك هەن کلیلی کردنەوەی خراپەن و داخەری خێر و چاکەن ، جا خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە خوا کلیلی کردنەوەی خێر و چاکە دەخاتە سەر دەستی ، وە وەیل و تیاچوون بۆ ئەو کەسەی کە خوا کلیلی کردنەوەی خراپە دەخاتە سەر دەستی .

---

[٧] سنن ابن ماجه رقم: (٢٣٧) ، وحسّنهُ الألباني في صحيح سنن ابن ماجه : (٤٦/١) .

# بەرهەمەکانی مەجلیسگێڕان و دانیشتن و هاوڕێیەتی کردن لەگەڵ چاکەکاراندا

ئەو خێر و بەرهەمانەی کە لە مەجلیسگێڕان و دانیشتن لەگەڵ کەسانی خێرکار و هاوڕێیەتی کردنی برادەری چاکەکار دەست دەکەون زۆرن ، ژماردن و کۆکردنەوەیان ناڕەحەتە ، وە ئەوە بەسە بۆ من کە لەم جێگایەدا هەندێکیان باس بکەم :

١ ـ لەوانە : بەڕاستی ئەو کەسەی کە دادەنیشێت و هاوڕێیەتی چاکەکاران دەکات بەرەکەت و خێر و فەڕی مەجلیسەکەیان دەیگرێتەوە ، وە ئەو خێرە کە دەستی ئەوان دەکەوێت ئەویش دەگرێتەوە ئەگەر چی کردەوەی ئەو کەسەش نەگاتە ئاستی ئەوان ، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەم فەرموودەیە :

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّٰه : ((إِنَّ لِلّٰه مَلاَئِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ ، فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللّٰهَ تَنَادَوْا هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ ، قَالَ : فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا ، قَالَ : فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ ـــ وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ ـــ مَا يَقُولُ عِبَادِي ؟ قَالُوا : يَقُولُونَ يُسَبِّحُونَكَ ، وَيُكَبِّرُونَكَ ، وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ .

قَالَ : فَيَقُولُ : هَلْ رَأَوْنِي ؟ قَالَ : فَيَقُولُونَ : لاَ وَاللّٰه مَا رَأَوْكَ ، قَالَ : فَيَقُولُ : وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً ، وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا ، وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا ، قَالَ : يَقُولُ : فَمَا

يَسْأَلُونِي ؟ قَالَ : يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ ، قَالَ : يَقُولُ : وَهَلْ رَأَوْهَا ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا ، قَالَ : يَقُولُ : فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصاً ، وَأَشَدَّ لَهَا طَلَباً ، وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً ، قَالَ : فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : مِنَ النَّارِ ، قَالَ : يَقُولُ : وَهَلْ رَأَوْهَا ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَوْهَا ، قَالَ : يَقُولُ : فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا ؟ قَالَ : يَقُولُونَ : لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَاراً ، وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً ، قَالَ : فَيَقُولُ : فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ ، قَالَ : يَقُولُ مَلَكٌ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ : فِيهِمْ فُلاَنٌ لَيْسَ مِنْهُمْ إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ ، قَالَ : هُمُ الْجُلَسَاءُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ)) .

وفي لفظ : ((فِيهِمْ فُلاَنٌ عَبْدٌ خَطَّاءٌ إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ مَعَهُمْ ، قَالَ فَيَقُولُ : وَلَهُ غَفَرْتُ هُمُ الْقَوْمُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ))[٨] .

**واتە : خوای گەورە هەندێك فریشتەی هەیە بە ڕێگاوبانەكاندا دەسوڕێنەوە و بە دوای مەجلیس و كۆڕی زیكرخوێنەكاندا دەگەڕێن ، جا ئەگەر خەڵكانێكیان دۆزیەوە كە زیكر و یادی خوا دەكەن بانگی یەكتر دەكەن :**

**وەرن بۆ لای پێویسیەكەتان ـ ئەوەی كە بە دوایدا دەگەڕێن ـ ، ئەوانیش دەوریان لێدەگرن بە باڵەكانیان تاوەكو ئاسمانی دونیا ..**

---

[٨] صحيح البخاري رقم : (٦٤٠٨) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٨٩) .

پەروەردگاریان پرسیاریان لێ دەکات ـ لە کاتێکدا کە ئەو زاناترە لەوان بە حاڵیان ـ ئایا بەندەکانم چیان دەوت ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : خوایە تۆیان پاك ڕادەگرت لە کەم و کوڕی و تۆیان بە گەورە دادەنا و سوپاس و ستایشی تۆیان دەکرد و تۆیان بەرز ڕادەگرت ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا منیان بینیوە ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : نەخێر سوێند بە خوا ئەی پەروەردگار تۆیان نەبینیوە ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا چۆن دەبوو ئەگەر منیان ببینایە ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : ئەگەر تۆیان ببینایە ئەوا زیاتر تۆیان دەپەرست و زیاتر تۆیان بەرز ڕادەگرت و زیاتر تۆیان پاك ڕادەگرت لە کەم و کوڕی ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا داوای چیان دەکرد ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : داوای بەهەشت دەکەن ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا بەهەشتیان بینیوە ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : نەخێر سوێند بە خوا ئەی پەروەردگار بەهەشتیان نەبینیوە ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا چۆن دەبوو ئەگەر بەهەشتیان ببینایە ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : ئەگەر بەهەشتیان ببینایە ئەوا زیاتر سوور دەبوون لە سەر بەدەست خستنی و زیاتر بە دوایدا دەگەڕان و زیاتر حەزیان لێدەکرد ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا پەنایان لە چی دەگرت ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : پەنایان دەگرت لە ئاگری دۆزەخ ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا ئاگری دۆزەخیان بینیوە ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : نەخێر سوێند بە خوا ئەی پەروەردگار ئاگری دۆزەخیان نەبینیوە ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا چۆن دەبوو ئەگەر ئاگری دۆزەخیان ببینایە ؟

فریشتەکانیش دەڵێن : ئەگەر ئاگری دۆزەخیان ببینایە ئەوا زیاتر ڕایان لێدەکرد و خۆیان لێ دوور دەخستەوە و زیاتر لێی دەترسان ..

خوای گەورە دەفەرموێت : ئێوە دەکەم بە شایەت لە سەر ئەوەی کە من لێیان خۆش بووم .

فریشتەیەك لە فریشتەکان دەڵێت : فلانە کەسیان تێدایە لەو کەسانە نییە کەوا زیکریان دەکرد بەڵکو بۆ کارێکی پێویست هاتبوو

خوای گەورە دەفەرموێت : ئەوانەی مەجلیسی زیکر دەگێڕن کەسانێکن ئەو کەسەی لەگەڵیاندا دابنیشێت بەد بەخت نابێت .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : فلانە کەسیان تێدایە بەندەیەکی تاوانبـارە و هەڵـەی زۆرە بـەڵام بـە لایانـدا تێپـەڕ بـووە و ئـەویش لەگەڵیاندا دانیشتووە .

خوای گەورە دەفەرموێت : لەویش خۆشبووم ، ئەوانە خەڵکانێکن ئەو کەسەی لەگەڵیاندا دابنیشێت بەد بەخت نابێت .

* (أبو الفضل الـــجوهري) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویـەتی : (بەڕاستی هەرکەسێك ئەهلی خێر و چاکەکارانی خۆشبوێت ئـەوا لـە بەرەکەت و خێر و فەڕی ئەوانی بەر دەکـەوێت ، سەگێك کەسانێکی خاوەن چاکەی خۆشویست و هاوڕێیەتی کردن ، بە هۆی ئەوەوە خوا لە قورئاندا باسی کردووە) .

مەبەسـتی بـەو سـەگە سـەگەکەی هـاوەڵانی ئەشـکەوتەکەیە (أصحاب الکهـــف) کە لـەم ئایەتـەدا بـاس کراوە : ﴿وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ﴿١٨﴾﴾ [سورة الکهف] .

واتە : سەگەکەیان هەردوو دەستی ڕاخـستبوو لـە پـاڵ دەرگـای ئەشکەوتەکەدا .

* (القرطبـــي) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە تەفسیرەکەیدا لـە دوای هێنانـەوەی وتەکـەی (الـــجوهري)دا فەرموویـەتی : (دەڵـێم : ئەگـەر هەندێك سەگ ئەم پلە بەرزەی دەست کـەوتبێت بـە هـۆی هاوڕێیـەتی

کردن و تێکەڵاوی کردنی چاکەکاران و دۆست و ئەولیاکانی خولوە ، تا ئەو ئاستەی کە خوا لە کتێبەکەیدا ئەو هەواڵەی باس کردووە ، ئایا گومانت چۆنە بەو ئیماندارە تەنها خواپەرستانەی کە تێکەڵاوی دۆست و ئەولیاکانی خوا و چاکەکاران دەکەن و خۆشیان دەوێن)[٩] .

* (الراغب الأصفهانـــي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (هەندێك لە دانایان وتویانە : هەر کەسێك لەگەڵ چاکەکارێکدا دانیشێت ئەوا بەرەکەت و فەڕی ئەوی بەر دەکەوێت ، هاوەجلیسی دۆستانی خوا بەد بەخت نابێت ئەگەر چی سەگێکیش بێت وەك سەگەکەی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە)[١٠] .

٢ ـ وە لەو بەرهەمانە : بەراستی مرۆڤ ڕاهاتووە لە سەر چاولێکردنی هاوەجلیس و هاوڕێکەی و کاریگەر دەبێت بە زانست و کردەوە و ئاکار و ڕەوشت و بەرنامەکەیەوە ، جا ئەو کەسەی هاوەجلیسی چاکەکاران بێت کاریگەر دەبێت پێیانەوە ، وە ئەوە جێگیربووە لای زانایانی پەروەردە کەوا کارتێکردن لە ڕێگای چاولێکردنەوە بەهێزترە لە کارتێکردن بە گوفتار و ئامۆژگاری کردنەوە ، لە بەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((الْمَرْءُ عَلَى دِينِ

---

[٩] الجامع لأحكام القرآن : (١٠ / ٣٧٢) في تفسير سورة الكهف .

[١٠] الذريعة إلى مكارم الشريعة ص : (١٩٢) .

خَلِيلِه ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ))[١١] .

واته : مرۆڤ لە سەر دینی خۆشەویستەکەیەتی ، جا با یەکێك لە ئێوە بڕوانێت بۆ ئەوەی بزانێت کێی خۆش دەوێت ؟

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کەوا مرۆڤ هاوشێوە و هاوونەی برادەر و هاوەجلیسەکەیەتی لە گرتنەبەری ڕێگای ڕاست و بەردەوام بوون لەسەری و کارچاکێتی و بە هەمان شێوەش لە نەبوونی ئەمانەدا ، لە بەر ئەمە بە مەبەستی هاندان بۆ هەڵبژاردنی هاوەجلیس فەرموویەتی : ((جا با یەکێك لە ئێوە بڕوانێت بۆ ئەوەی بزانێت برادەرێتی کێ دەکات)) ، واتە : با وورد ببێتەوە بۆ ئەوەی بۆی ڕوون ببێتەوە ئایا کێ برادەریەتی ؟ وە بۆ ئەوەی برادەر و هاوڕێیەك هەڵبژێرێت کە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بێت .

قال الخطابي : (قوله :"المَرْءُ على دين خليله" معناهُ : لا تُخالِلْ إلاَّ مَنْ رضيت دينه وأمانته ، فإنَّك إذا خاللتهُ قادكَ إلى دينه ومذهبه ، فلا تُغرِّرْ بدينك ، ولا تُخاطر بنفسك ، فتخالِل من ليس مَرضياً في دينه ومذهبه)[١٢] .

---

[١١] رواه أبو داود : (١٦٨/٥) والترمذي : (٥٨٩/٤ ـــ ح ٢٣٧٨) وأحمد : (٣٠٣/٢) والبغوي في شرح السنة : (٧٠/١٣) وحسنهُ الترمذي والبغوي والألباني في الصحيحة رقم : (٩٢٧) ، وحسنهُ العلائي في كتاب النقد الصحيح رقم : (١١) وصحح إسناده النووي في رياض الصالحين رقم : (٣٧١) .

[١٢] كتاب العزلة ص : (١٤١) .

واتە : مانای " مرؤڤ لە سەر دینی برادەرەكەیەتی " ئەوەیە : برادەرێتی كەس مەكە تەنها كەسێك نەبێت كە ڕازیت لە دین و ئەمانەتی ، چونكە ئەگەر تۆ برادەرێتیت كرد ئەوا دەتبات و ڕاتدەكێشێت بۆ لای دین و بۆچوونەكەی خۆی ، كەواتە دینەكەت مەخەرە حاڵەتێكەوە كە تێیدا مەڵبخەڵەتێت ، و خۆت مەخەرە مەترسییەوە بەوەی كە برادەرێتی و هاوڕێیەتی كەسێك بكەیت كە لە دین و بۆچوونیدا جێی لێ ڕازیبوون نەبێت .

* وە (سفيان بن عينة) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (انظروا إلـى فرعون معه هامان ! انظروا إلـى الـحجاج معه يزيد بن أبي مسلم شرٌ منه ! انظروا إلـى سليمان بن عبد الـملك صَحِبَهُ رجـاء بن حيوة فقوَّمه وسدَّده)[١٣] .

واتە : بڕوانن بۆ فیرعەون هامانی لە گەڵدایە ! بڕوانن بۆ حەججاج یەزیدی كوڕی موسلیمی لە گەڵدایە كە لە خۆی خراپترە ! بڕوانن بۆ سولەیمانی كوڕی عبد الـملك ڕەجائی كوڕی حەیوە هاوڕێیەتی كردووە كە بووە هۆی ڕێك كردنەوە و ڕاستكردنەوەی .

* وە (ابن مسعود ﷺ) فەرموویەتی : (ما مِنْ شيءٍ أدلَّ على شيءٍ ولا الدخان على النار من الصاحب على الصاحب)[١٤] .

---

[١٣] كتاب العزلة ص : (١٤١) .

[١٤] أدب الدنيا والدين للماوردي ص : (١٦٧) .

واته : هیچ شتێك نییه بەلكه بێت له سەر شتێك و بووكەڵ بەلكه بێت له سەر بوونی ئاگر وەك هاوڕێ بۆ ناساندنی هاوڕێ .

* هەروەها (ابن مسعود ﷺ) فەرموویەتی : (اعتبروا الناس بأخدانهم [أي أصدقائهم] ، فإنَّ الرجل يُخادنُ من يُعجبهُ نحوه)[١٥] .

واته : خەلك بپێون بە برادەرەكانیان ، چونكه پیاو برادەرێتی كەسێك دەكات كەوا پێی سەرسام بێت .

* وە ئیمامی (مالك) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (الناس أشكالٌ كأشكالِ الطير ، الحَمام مع الحمام ، والغُراب مع الغُراب ، والبَطُّ مع البطِّ ، والصَّعْو مع الصَّعْو ، وكلُّ إنسانٍ مع شكله)[١٦] .

واته : خەلك هەمەجۆرن وەك هەمەجۆرێتی باڵندە ، كۆتر لەگەڵ كۆتردایە ، و قەلەڕەش لەگەڵ قەلەڕەشدایە ، و سۆنە لەگەڵ سۆنەدایە ، و چۆلەكە لەگەڵ چۆلەكەدایە ، و هەموو مرۆڤێكیش لەگەڵ هاوشێوەكەی خۆیدایە .

وە پێشەوا (ابن تيمية)ش ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (الناس كأسراب القطا مجبولون على تشبه بعضهم ببعض)[١٧] .

واته : خەلك وەكو پۆلە كورکوڕ وان ڕاهێنراون لەسەر خۆشوبهاندنی هەندێكیان بە هەندێكی تریانەوە .

---

[١٥] كتاب الإخوان لابن أبي الدنيا ص : (١٢٠) .

[١٦] روضة العقلاء لابن حبان ص : (١٠٩) .

[١٧] مجموع الفتاوى : (٢٨ / ١٥٠) .

* وە هەندێك لە دانایان وتویانە : (اعرِفْ أخاكَ بأخيهِ قبلكَ)[١٨].

واتە : برادەرەکەت بناسەوە بە برادەرەکەی لە پێش تۆ .

واتــە بەڕاســتی ئــەو بــرادەرە لــە ســەر بۆچــوون و ڕێبــازی برادەرەکەیــەتی کــە هاومەجلیــسی بــووە پــێش ئــەوەی ببێتــە هاومەجلیس لەگەڵ تۆدا .

* وە (ابن حبان) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (مِنْ أعظم الدلائل على معرفة ما فيه الـمرء من تقلّبه وسكونه هو الاعتبــار بمَــنْ يُحادثه ويودّه ، لأنّ الـمرء على دين خليلــه ، وطَــيرُ الـسماء علــى أشكالــها تقع)[١٩].

واتە : لە گەورەترین بەڵگەکان لە سەر ناسینەوەی ئەوەی کە لە مرۆڤـدا هەیـە لـە گۆڕانکـاری و دامـەزراوێتی بریتیـیە لـە پێـوەری هەڵـسەنگاندنی بـەو کەسـەی کـە گفتوگـۆی لەگەڵـدا دەکـات و دۆسـتایەتی لـە گەڵـدا هەیـە ، چـونکە مرۆڤـ لـە سـەر دیـنی برادەرەکەیەتی ، وە باڵندەکانی ئاسمان لە سەر شێوەی خۆیان پێك دێن و دەبن .

* وە (عدي بن زيد) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

---

[١٨] أدب الدنيا والدين ص : (١٦٧) .

[١٩] روضة العقلاء ص : (١٠٨) .

(عن المرء لا تسأل وسَل عن قرينه
فكُلُّ قرينٍ بالمُقارَنِ يقتدي
إذا كنتَ في قومٍ فصاحِبْ خيارَهم
ولا تَصحَبْ الأردَى فتردَى مع الردي)[٢٠].

واتە : پرسیار مەکە دەربارەی مرۆڤ بەڵکو دەربارەی هاوڕێ و برادەرەکەی پرسیار بکە .. چونکە هەموو برادەرێك چاو لە برادەرەکەی دەکات ، ئەگەر تۆ لە نێو خەڵکانێکدا بوویت ئەوا هاوڕێیەتی چاکترینەکەیان بکە .. وە هاوڕێیەتی خراپەکەیان مەکە چونکە لەگەڵ خراپەکەیاندا دەکەویتە خوارەوە .

* وە (المنتصر بن بلال) رەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

(يزينُ الفتَى في قومِهِ ويُشينُهُ
وفي غيرِهم : أخدانُهُ ومداخلهُ
لكل امريءٍ شَكْلٌ من الناس مِثْلُهُ
وكُلُّ امريءٍ يَهوى إلى مَنْ يُشاكلهُ)[٢١].

واتە : ئەوەی لاو برازێنێتەوە و لەکەدلری بکات لە نێو قەومەکەی و لە نێو جگە لەوانیشدا بریتییە لە برادەرەکانی و ئەوانەی کە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت دەکات ..

---

[٢٠] أدب الدنيا والدين ص : (١٦٧) . [٢١] روضة العقلاء ص : (١٠٩) .

هەموو مرۆڤێك هاوڕێنەی خۆی هەیە لە نێو خەڵکدا ، وە هەموو مرۆڤێك حەزی لەو کەسەیە کە لە خۆی دەچێت .

* وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ))[٢٢].

واتە : ڕۆحەکان هەریەك لە سەر ئەو ڕەوشتە دروست کراون کە لەسەری ڕاهێنراون ، جا ئەوانەیان یەکتر دەناسن و ئاشنان بە یەکتر یەك دەگرن ، وە ئەوانەیان یەکتر ناناسن و نامۆن بە یەکتر جیاواز دەبن .

قال الخطابي : (يقول ﷺ : إنّ الأجسادَ التي فيها الأرواح تلتقي في الدنيا ، فتأتلف وتختلف على حسب ما جُعلت عليه من التشاكُل أو التنافر في بدء الخلقة ، ولذلك ترى البرَّ الخيِّر يحب شكله ، ويَحنُّ إلى قرْبه ، وينفر عن ضدِّه ، وكذلك الرَّهق الفاجر يألف شكله ، ويستحسن فعله وينحرف عن ضدِّه)[٢٣].

---

[٢٢] أخرجهُ مسلم رقم : (٢٦٣٨) من حديث أبي هريرة ، وعلقه البخاري عن عائشة رقم : (٣٣٣٦) .

[٢٣] معالم السنن : (٧ / ١٨٧) بهامش المنذري .

وە (ابن حجر) لە کتێبی (فتح الباري)دا : (٦/٤٤٦) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی : (قَالَ الْخَطَّابِيُّ : يُحْتَمَل أَنْ يَكُون إِشَارَة إِلَى مَعْنَى التَّشَاكُل فِي الْخَيْر وَالشَّرّ وَالصَّلَاح وَالْفَسَاد ، وَأَنَّ الْخَيِّر مِنْ النَّاس يَحِنُّ إِلَى شَكْله وَالشِّرِّير نَظِير ذَلِكَ يَمِيل إِلَى نَظِيره ، فَتَعَارُفُ الْأَرْوَاح يَقَع بِحَسَبِ الطِّبَاع الَّتِي جُبِلَتْ عَلَيْهَا مِنْ خَيْر وَشَرّ

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : بەڕاستی ئەو لاشانەی كە ڕۆحیان تێدایە لە دونیادا بە یەك دەگەن ، ئەنجا یەكدەگرن و جیاواز دەبن بە پێی ئەوەی كە تێیاندا هەیە لە هاوشێوەیەتی یان لە نەسازێتی و لە یەكتر دووركەتنەوە لە سەرەتای درووست بوونیانەوە ، لە بەر ئەوە دەبینیت چاكەكار و خێر ویست هاوشێوەی خۆی خۆشدەوێت و شەیدا و تامەزرۆی هاوڕێنەی خۆیەتی و دوور دەكەوێتەوە لە دژەكەی ، بە هەمان شێوە مرۆڤی سوك و خراپەكار هۆگری هاوشێوەی خۆی دەبێت و كردارەكانی بە باش دادەنێت و خۆی لادەدات لە دژەكەی .

* وە (ابن الجوزي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :
(يُسْتَفَادُ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَنَّ الْإِنْسَانَ إِذَا وَجَدَ مِنْ نَفْسِهِ نُفْرَةً عَنْ ذِي فَضْلٍ وَصَلَاحٍ فَيَنْبَغِي أَنْ يَبْحَثَ عَنْ الْمُقْتَضِي لِذَلِكَ لِيَسْعَى فِي إِزَالَتِهِ

---

، فَإِذَا اتَّفَقَتْ تَعَارَفَتْ ، وَإِذَا اخْتَلَفَتْ تَنَاكَرَتْ) .

واتە : (الخطابي) فەرمویەتی : لەوانەیە ئەمە ئاماژە بێت بۆ واتای لەیەكچوون لە خێر و شەڕ و چاكێتی و خراپێتیدا ، وە خەڵكی چاك ئارەزووی هاوشێوەكەی دەكات و خراپەكاریش بەهەمان شێوە ئارەزووی هاوڕێنەكەی دەكات ، كەواتە ناشنا بوون و یەكتر ناسینەوەی دەروونەكان ڕوو دەدات بە پێی ئەو خووەی كە لە سەری ڕاهێنراوە لە چاكە و خراپەدا ، جا ئەگەر پێكەوە گونجان ئەوا ئاشنا دەبن بە یەكتر ، وە ئەگەر جیاواز بن ئەوا یەكتر ناناسنەوە . ـ وەرگێڕ ـ

حتَّى يَتخَلص مِنَ الوَصْفِ المَذمُوم ، وَكَذَا عَكسُهُ)[٢٤] .

واتـه : ئـهم فەرموودەیـه سـوودی ئـەوەی لـێوەردەگیرێت کـەوا ئەگەر مرۆڤ خۆنوورخستنەوەی لـه خـاوەن چـاکه و چـاکەکاران لـه خۆیدا بە دیکرد ئـەوا پێویسته بگـەڕێت بـەدوای هۆکـاری ئەمـەدا بـۆ ئەوەی هـەوڵ بدات بۆ نەهێشتنی ئـەنجا ڕزگـاری ببێـت لـەو سیفەتە زەمکراوە ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە .

٣ ـ وە لەو بەرهەمانە : بەڕاستی هاوەـەجلیس و بـرادەری چـاکت عەیب و کەموکوڕییەکان و لایەنەکانی لاوازیت دەخاتە پێش چـاوت ، هەروەها شوێنەکانی نەخۆشی لە خۆت و ڕەوشتیشدا پیشانت دەدات ، ئــەو کاتــە تــۆش بــەرەو چارەســەر و چــاککردنەوەی کــەلێن و کەموکوڕیەکان و نەهێشتنی عەیبەکانت دەڕۆیت ، لەبەر ئەمە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) ئیمانداری ـ لـه ڕووی ئـەوەی کـه برلکـەی چـاو ڕۆشـن دەکاتەوە بە کەلێن و کەموکوڕییەکانی ـ شوبهاندووە بە ئاوێنە کـەوا مرۆڤ کـەموکوڕییە ڕواڵەتییەکانی تێدا بە دی دەکـات ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ))[٢٥] .

---

[٢٤] دليل الفالحين : (٢ / ٢٣٧) والفتح : (٦ / ٣٧٠) .

[٢٥] رواه أبو داود رقم : (٤٩١٨) من حديث أبي هريرة ، وحسّنه العراقي في تخريج الإحياء : (١٨٢/٢) وابن حجر في بلوغ المرام باب الترغيب في مكارم الأخلاق والألباني في الصحيحة رقم : (٩٢٦) وصحيح سنن أبي داود : (٣ / ٩٢٩) .

ولته : ئیماندار ئاوێنەی ئیماندارە .

کەواتــە ئیمانــدار ئاوێنــەی براکەیــەتی ، لــە ڕێگــای ئــەوەوە کەموکوڕییە هەڵسوکەوتی و نابەرچاویەکانی خۆی دەبینێت ، چونکە بەڕاستی براکەی شتانێکی دەخاتە پێش چاو کەوا زۆر جارێك خۆی نایبینێــت و هەســتی پێناکــات ، وەك چــۆن ئاوێنــە کەموکوڕییــە ڕواڵەتییەکانی پێشان دەدات کەوا خۆی نایبینێت ئیللا لە ڕێگای ئــەوەوە نــەبێت ، وە گۆڕینــەوەی کەموکوڕییــەکان لــە نێــوان چاکەکاراندا ڕێڕەوێکی شوێنکەوتو و باو (مەشهور) بووە .

* (الــحسن البصري) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

(الــمُؤمنُ مرآةُ أخيه : إنْ رأى فيه ما لا يُعجبهُ سدَّده وقوَّمه وحاطهُ وحفظهُ فــي الســرِّ والعلانية)[٢٦].

واته : ئیماندار ئاوێنەی براکەیەتی : ئەگەر شتێکی تێدا بینی کە پێی بــاش نــەبێت ئــەوا ڕاســت و ڕێکــی دەکاتــەوە و دایدەپۆشــێت و دەیپارێزێت لە پەنهانی و ئاشکرایشدا .

٤ ـ هاومــەجلیس و برادەرانــت لــە چــاکەکاران دەتکەیــەنن بــە کەسانێکی تــر کــەوا ســوودیان لێدەبینیت وەك چۆن سوودت لــەوان بینیوە ، چــەندین کــەس هەیــە یــەکێك لــە چــاکەکارانی ناسیوەتەوە

[٢٦] كتاب الإخوان لابن أبي الدنيا ص : (١٣١) .

ئەنجا ئەوەندەی بە سەر نەچووە چەندین پۆل لە چاکەکارانی تری ناسیوەتەوە لە ڕێگای ئەو کەسەوە ، بەمەش چاکە و خێری زیاتری دەست کەوتووە .

٥ ـ بە ڕاستی تۆ لە ڕوانگەی بەراورد کردنی کردار و ڕەوشتەکانت لەگەڵ ئەوەی کەوا هاوەجلیس و برادەرە چاکەکارەکانت لە سەری دەڕۆن لەم بوارانەدا کەوا زانیاریان لایە و ئاگادارن لێیەوە هەڵەکانی خۆت دەناسیتەوە لە هەڵسوکەوت و ڕەوشتەکانتدا ، ئەنجا ئەو هەڵانە ڕاست دەکەیتەوە .

٦ ـ بەڕاستی تۆ بە هۆی هاوەجلیس و برادەرە چاکەکارەکانتەوە خۆت دەگریتەوە لە تاوان و سەرپێچیەکان ، چونکە بەڕاستی ئەگەر لە گەڵیدا دانیشتیت ئەوا ئەمە داخوازیت لێدەکات کەوا ڕێزی مەجلیسەکەی بگریت و وازبێنیت لە تاوان لەبەر بە ئاگابوون لە حورمەتی و ڕێز گرتن لە پلەوپایە و پێگەی لەو مەجلیسەدا ، کەواتە ئەو خۆگرتنەوە و وازهێنانە کاتیەیە دەبێتە هۆکارێك بۆ دوورکەوتنەوەی بەردەوام لەو حەرام و قەدەغەکراوانە .

٧ ـ هاوەجلیس و برادەری چاکەکار ڕێنماییت دەکات بۆ بوارەکانی خێر و چاکە کەوا زانینی ئەوانە سوودت پێ دەگەیەنێت ، بۆ نموونە ڕێنماییت دەکات بۆ هەندێك لە فەرزەکان کەوا تۆ بێ ئاگا بوویتە لێیان یان کەمتەرخەم بوویتە و تەمبەڵیت کردووە لە

جێبەجێکردنیاندا ، وە ڕێنماییت دەکات بۆ زۆرێك لە سوننەتەکان کەوا خێر و چاکەت پێیان زیاد دەکات ، وە ئاگادارت دەکاتەوە لە شتانێکی حەرام و قەدەغەکراو کەوا تۆ تێیکەوتویت ، وە هانت دەدات بۆ چەندین پرۆژە لە پرۆژەکانی خێر و چاکە .

٨ ـ تۆ سەیری پلە بەرزێتی برادەری چاك دەکەیت لە زانست و خواپەرستی و بانگەوازکردن و ڕەوشت و هەڵسوکەوتیدا، وە دەبینیت پێش تۆ کەوتووە لە زۆرینەی لایەنەکانی خێر و چاکەدا ، جا ئەمە دەبێتە مایەی بەرژەوەندی و سوود لێوەرگرتن بۆ تۆ لە دوو ڕووەوە :

**یەکەم** : نەمانی ئەوەی کە لە تۆدا هەیە لە سەرسوڕمان بە خۆت و کردەوەتەوە (لەخۆبایی بوون) کاتێك دەبینیت کەسانێك هەن لە تۆ چاك ترن ، وە لەخۆبایی بوون لەو شتانەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لێی ترساوە بۆ ئوممەتەکەی و بە توند تر لە تاوان لە قەڵەمی داوە ، وەك فەرموویەتی : ((لو لـم تكونوا تُذنبون لَخِفْتُ عليكم ما هو أشدّ مـن ذلك العُجْبَ العُجْبَ))[٢٧].

واتە : ئەگەر ئێوە تاوان نەکەن ئەوا ترسی لە تاوان توندتـرم لە

[٢٧] أخرجهُ القضاعي في مسند الشهاب : (٢ / ٣٢٠ ـ ح ١٤٤٧) والبزّار في مسنده "كشف الأستار" (٤/ ٢٤٤ ـ ح ٣٦٣٣) ، وقال المنذري في الترغيب : (٤/ ٢٠) والهيثمي في مجمع الزوائد : (١٠ / ٢٦٩) : إسنادهُ جيّد ، وحسّنهُ الألباني في السلسلة الصحيحة رقم : (٦٥٨) .

سەرتان هەیە تووشتان ببێت : لەخۆبایی بوونە لەخۆبایی بوون .

دووەم : بەڕاستی ئەوە دەبێتە هۆکارێك بۆ پێشبڕکێ کردنت لە گەڵیدا لەو سیفەت و کردەوانەدا ، بەمەش زیاتر سوور دەبیت لە سەر بەدەست خستنی زانست و هەستان بە خواپەرستی و چاك کردنی ڕەوشت و هەڵسوکەوت ، و جگە لەمانەش .

بۆیە لە بەر ئەمە (عثمان بـــن حکـــيم) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (اصحَبْ مَنْ هو فوقكَ في الدِّين ودونكَ في الدنيا)[٢٨].

واتە : هاوڕێیەتی کەسێك بکە لـە سـەرووی تـۆوە بێـت لـە بـواری دیندا و لە خوارەوەی تۆشدا بێت لە بواری دونیادا .

٩ ـ دانیـــشتنت لەگـــەڵ هاوەـــجلیس و بـــرادەری چـــاکەکاردا پاراستنی کاتی تێدایە کە بریتی‌یە لـە ژیـان و بریتی‌یە لـە خەزێنـەی هەموو کردەوەکان .

١٠ ـ بەڕاستی هاوەجلیس و برادەری چاکەکارت دەتپارێزێت لـە کـاتی ئامـادە بوونـت و لـە کـاتی ئامـادە نەبوونیـشتدا ، سیڕ و نهێنییەکانت ئاشکرا ناکات و پەردەی لە سەر هەڵناماڵێت و ناوبـانگ و حورمـەتت ناشـکێنێت و بـەرگریت لێـدەکات لـەو جێگایانـەدا کـە پێویستیت بە کەسێکە بەرگریت لێبکات .

---

[٢٨] الإخوان ص : (١٢٥) .

١١ ـ بەڕاستی مرۆڤ تەنها بە بینینی پیاوچاكان و چاكەكاران خوای بیردەكەوێتەوە و یادی خوا دەكات ، وە واقع و شەرعیش بەڵگەن لە سەر ئەم ڕاستییە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((أولياءُ الله تعالى الذين إذا رؤوا ذُكِرَ اللهُ تعالى))[٢٩].

واتە : دۆستان و ئەولیاكانی خوای پایەبەرز ئەوانەن كەوا ئەگەر ببینرێن لە لایەن خەڵكەوە ئەوا خوای پایەبەرزیان بیردەكەوێتەوە .

وە لە فەرموودەیەكی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((ألاَ أُنَبِّئُكُمْ بِخِيَارِكُمْ ؟ قَالُوا : بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ ، قَالَ : خِيَارُكُمُ الَّذِينَ إِذَا رُءُوا ذُكِرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ))[٣٠].

واتە : ئایا هەواڵتان نەدەمێ چاكترینتان كێیە ؟ وتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : چاكترینتان ئەوانەن كەوا ئەگەر بینران لە لایەن خەڵكەوە ئەوا خوای پایەبەرزیان بیردەكەوێتەوە .

جا پێغەمبەر (ﷺ) لەم دوو فەرموودەیەدا ئەوەی سەلماندووە كەوا دۆستانی خوا و چاكەكاران كاریگەریان هەیە لە سەر ئەوانەی كە

---

[٢٩] عزاه السيوطي في الجامع الصغير للحكيم عن ابن عباس مرفوعاً ، ووحسّنهُ الألباني في صحيح الجامع رقم : (٢٥٥٧) .

[٣٠] أخرجه ابن ماجه في سننه : (٢ / ١٣٧٩ ـ ح ٤١١٩) من حديث أسماء بنت يزيد ، وحسَّن إسنادَهُ البوصيري في الزوائد : (٣ / ٢٧٣) ، وله شواهد منها عن عبد الرحمن بن غنم وعبادة بن الصامت وعبد الله بن عمر وابن عمرو وابن عباس وغيرهم .

دەیانبینن ، وە ئەوانەی کە دەیانبینن ـ تەنها بەم بینینە ـ خوای گەورەیان بیردەکەوێتەوە .

وە لەوانەیە هۆی ئەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تێیاندا بە دی دەکرێت لە ڕەوشت و ئاکار و قورس و سەنگینیان و نور و ڕووناکی ئیمان و چاکێتی ژیاننامەیان .

جا ئەگەر ئەمە دەست کەسێك بکەوێت کە دەیانبینێت ئایا دەبێت ئەوانە چۆن بن کەوا لەگەڵیاندا دادەنیشن و تێکەڵیان دەکەن .

* لە بەر ئەمە (موسى بن عقبة) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (إنْ كنتُ لألقى الأخَ من إخواني فأكون بلُقيِّهِ عاقلاً أياماً)[٣١].

واتە : من کاتێك کە دەگەیشتم بە برادەرێك لە برادەرەکانم ئەوا بە پێگەیشتنەکەی چەند ڕۆژێك ژیر و عاقڵ و هۆشیار دەبوومەوە .

* وە (سفیان) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (لربَّما لقيتُ الأخ من إخواني فأقيم شهراً عاقلاً بلقائه)[٣٢].

واتە : بەڕاستی من چەندین جار کە دەگەیشتم بە برادەرێك لە برادەرەکانم ئەوا بە پێگەیشتنەکەی یەك مانگ ژیر و عاقڵ و هۆشیار دەبوومەوە .

---

(٣١) روضة العقلاء ص : (٩٢) .

(٣٢) المصدر السابق ص : (٩٣) .

* وە (أبو سليمان) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (كنتُ أنظرُ إلـــى أخٍ من إخوانـــي بالعراق فأعمل على رؤيته شهراً)[33].

واتە : من کاتێك دەمروانیە برادەرێك لە برادەرەکانم لە عێراقدا ئەوا بە بینینەکەی یەك مانگ کردەوەم دەکرد .

١٢ - بەڕاستی هاوەجلیس و برادەری چاکەکار ڕازێنەرەوە و دڵخۆشکارن بۆت لە خۆشیدا و کەرەستەی پشتگیریشن لە ناخۆشیدا ، ئەوانە باشترین یارمەتیدەرن بۆت بۆ کەم کردنەوەی خەم و خەفەتەکانت و چارەسەری کێشە و گرفتەکانت بەبیر و هەڵ و بۆچوونت ڕۆشن دەبێتەوە بە بۆچوون و بیروڕا و ڕێنماییەکانیان ، بەتایبەت لە کاتێکدا کە گرفتەکان لێت کۆدەبنەوە و ڕێگا چارەکانت لێ تەنگ دەبێتەوە و ڕێنموونەکانی چارەسەر نادۆزیتەوە .

جارێکیان (ابن مسعود ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە بۆ لای هاوڕێکانی و پێی فەرموون : (أنتم جلاءُ حُزنـــي)[34].

واتە : ئێوە ڕەوێنەرەوەی غەم و پەژارەکانمن .

* وە (أكثم بن صيفي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (لقاءُ الأحبَّةِ مسلاةٌ للهَم)[35].

---

[33] السابق ص : (٩٢) .

[34] روضة العقلاء ص : (٩٢) .

[35] الإخوان لابن أبي الدنيا ص : (١٥٥) .

واتە : گەیشتن بە خۆشەویستان ڕەوێنەرەوەی غەم و پەژارەکانە .

* وە (عمر بن الخطاب ﷺ) فەرموویەتی : (عليكَ بإخوان الصدق ، فعِشْ في أكنافهم ، فإنّهم زَيْنٌ في الرَّخاء ، وعُدَّةٌ في البلاء)[٣٦].

واتە : برادەری ڕاست و ڕاستگۆ بگرە خۆت ، و لە لایاندا بژی ، چونکە بەڕاستی ئەوانە ڕازێنەرەوەن لە خۆشیدا و کەرەستەی پشتگیریشن لە ناخۆشیدا .

* وە (علي بن أبي طالب ﷺ) فەرموویەتی : (عليكم بالإخوان فإنّهم عُدَّةٌ في الدنيا والآخرة)[٣٧].

واتە : پەیوەست بن بە برادەرانی چاکەکارەوە چونکە بەڕاستی ئەوانە پشتیوان و زەخیرەن لە دونیا و دواڕۆژدا .

* وە پیاوێك وتی بە (داود الطائي) ڕەحمەتی خوای لێبێت ئامۆژگاریم بکە ؟

ئەویش فەرمووی : (اصحَبْ أهل التقوى ، فإنّهم أيسر أهل الدنيا عليك مؤونةً ، وأكثرهم لك معونةً)[٣٨].

---

(٣٦) السابق ص : (١١٦) والمتحابين في الله للمقدسي ص : (٣١) وروضة العقلاء ص : (٩٠) .

(٣٧) إحياء علوم الدين : (٢ / ١٦٠) .

(٣٨) كتاب الإخوان ص : (١٢٤) .

واتە : هاوڕێیەتی لە خواترسان و خۆپارێزەران لە تاوان بكە ، چونكە ئەوانە لە هەموو خەڵكی دونیا كەمتر ئەركیان هەیە بە سەرتەوە ، وە لە هەموویان زیاتر هاوكاریت دەكەن .

* وە (شبیب بن شیبة) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

(إخوان الصدق خير مكاسب الدنيا ، وهم زِينةٌ في الرَّخاء ، وعُدَّةٌ في البَلاء ، ومَعونةٌ على حُسن المعاشرة)[٣٩].

واتە : برادەری ڕاست و ڕاستگۆ باشترینی دەستكەوتەكانی دونیایە ، ئەوانە ڕازێنەرەوەن لە خۆشیدا و كەرەستەی پشتگیریشن لە ناخۆشیدا ، و یاریدەدەرن لە سەر هەڵسوكەوت كردن بە چاكە .

* وە هەندێك لە دانایان فەرموویانە : (اصطف من الإخوان ذا الدِّين والحسب والرأي والأدب ، فإنَّهُ رِدْءٌ لك عند حاجتك ، ويَدٌ عند نائبتك ، أُنسٌ عند وحشتك ، وزَينٌ عند عافيتك)[٤٠].

واتە : لەو برادەرانە هەڵبژێرە كەوا خاوەن دین و ئاودارى و بۆچوونی ڕاست و ڕەوشتی جوانە ، چونكە یارمەتی دەرە بۆت لە كاتی پێویستیدا ، وە پاڵ پشتە لە كاتی تەنگانەتدا ، وە دڵنەوایی كارە لە كاتی تەنهاییدا ، وە ڕازێنەرەوەیە لە كاتی خۆشیتدا .

---

[٣٩] كتاب المتحابين في الله ص : (٣٠) .

[٤٠] أدب الدنيا والدين ص : (١٦٨) .

* وە (عبد العزيز الأبرش) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

استكثرنْ من الإخوان إنّهم
خير لكانـــزهم من الذّهـــبِ
كم من أخٍ لـــو نابتك نائبةٌ
وجدتهُ خيراً من أخي النّسبِ[٤١]

واتە : با برادەری زۆرت هەبێت چونکە ئەوانە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خۆیانیان دەگرن چاك ترن لە زێڕ ..

چەندین برادەر هەیە کاتێك گرفتێك دێتە ڕێت دەبینیت چاك ترە بۆت لە برای باوکیت .

* وە (مهدي بن سابق) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

تكثّرْ من الإخوانِ ما اسْطعْتَ فإنّهم
عِمادٌ إذا استنجدتــــهم وظُهور[٤٢]

واتە : با برادەری زۆرت هەبێت تا لە توانادا هەیە چونکە ئەوانە لە کاتێکدا کە هاواریان تێدەکەیت پشت و پەنان بۆت .

١٢ ـ بەڕاستی برادەرێتی و هاوڕێیەتیت بۆ چاکەکاران هۆکارێکە بۆ ئەوەی بچیتە ناو ڕیزی ئەو کەسانەوە کەوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئە

---

[٤١] روضة العقلاء ص : (٩٣) .

[٤٢] روضة العقلاء ص : (٩٤) .

ترسیان هەیە و نە خەم و پەژارە ، هەروەها بەردەوامێتی هاوڕێیەتی و نەپچرانیت بۆ مسۆگەر دەکات ، هەر وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَـٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ [سورة الزخرف] .

واتە : لە ڕۆژی قیامەتدا برادەرەکان هەندێکیان دەبن بە دووژمنی هەندێکی تریان ئیللا لە خوا ترسەکان و خۆپارێزەرەکانیان لە تاوان نەبێت ، ئەی بەندەکانم ئێوە ئەمڕۆ نە ترستان لە سەرە و نە خەم و پەژارەشتان هەیە .

١٤ ـ تۆ سوودمەند دەبیت بە دوعا و پاڕانەوەی برادەر و هاوڕێ چاکەکانت کە بۆت دەپاڕێنەوە لە ژیانتدا و لە دوای مردنیشتدا ، چونکە بەڕاستی یەکێك لە داب و عادەتی چاکەکارلن ئەوەیە کەوا هەندێکیان دوعا بۆ هەندێکی تریان دەکەن ، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ : آمِينَ ، وَلَكَ بِمِثْلٍ))[١٣] .

واتە : دوعای کەسێکی موسڵمان بۆ براکەی لە پەنهانیدا دوعایەکی وەرگیراوە ؛ لە لای سەریەوە فریشتەیەك ڕاسپێردراوە

---

[١٣] صحيح مسلم : (٤ / ٢٠٩٤ ـــ ح ٢٧٣٣) عن أم الدرداء .

بەوەی کە هەر کاتێك ئەو دوعای خێر بکات بۆ برایەکی موسڵمانی ئەوا ئەو فریشتە راسپێردراوە دەڵێت : خوایە دوعاکەی گیرا بکە وە بە هەمان شێوەی ئەو داواکاریە بۆ خۆشی جێبەجێبکە .

* (عبد الله بن الـــحسن) رەحمەتی خوای لێبێت بە پیاوێکی فەرمووە : (استكثر من الصديق ــ يعني الصالــح ــ ، فإنَّ أيـسر مـا تصيب أنْ يبلغهُ موتكَ فيدعو لكَ)[٤٦].

واتە : با برادەری چاکت زۆر هەبێت چونکە بەڕاستی کەمترین دەستکەوتت لێیەوە دەستکەوێت ئەوەیە کەوا کاتێك هەواڵی مردنتی پێدەگات دوعات بۆ دەکات .

وە لەو باسە خۆشانەی کە دەگێڕێتەوە زانا و فەرمووددەناس (الــخطيب البغدادي) لە کتێبی (تاريخ بغداد)دا لە پێناسەی (الطــيب بن إسماعيل) رەحمەتی خوای لێبێت (یەکێکە لە قورئان خوێنە بە ناوبانگەکان) دەگێڕێتەوە : کەوا دەفتەرێکی هەبووە ناوی (٣٠٠) سێسەد لە هاوڕێکانی تێدا نووسیبوو هەموو شەوێك دوعای بۆ هەموویان دەکرد ، جا شەوێك خەوی لێکەوت و بۆیان نەپاڕایەوە ، بۆیە لە خەودا پێی وترا : ئەی باوکی حەمدون ئەم شەو چراکەت داڵنەگیرسا !

---

[٤٦] كتاب الإخوان ص : (١١٣) .

ئەویش هەستا چراکەی داگیرساند و دانیشت و دەفتەرەکەی هێنا وە لە دانە بۆیان پاراپێیەوە تاوەکو کۆتایی پێیان هێنا[45].

١٥ ـ بەڕاستی مەجلیسی چاکەکاران شەیتانەکانی جنۆکە و مرۆڤـ پێی ناوێرن چونکە مەجلیسەکانیان قەڵایەکی پارێزەرە لە وەسوەسە و زیانی شەیتانەکان ، بە پێچەوانەی مەجلیسەکانی خراپەکاران کە بەڕاستی شوێنی جێگیر بوون و تیاچەقبوونی ئەو شەیتانانەیە ، هەروەها ئەگەر مرۆڤ دوورەپەرێز بێت ئەوا لە ڕێی ئەوەدایە کە وەسوەسە و دڵەخورپێی گەنیو و بیرۆکەی لە ڕێدەرچوو لە ناوی بەرێت کە شەیتان دەیخاتە نێو دڵیەوە ، لە بەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((علیكَ بالجماعة فإنما یأكلُ الذئبُ القاصیة))[46].

واتە : پەیوەست بن بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە* چونکە بەڕاستی گورگ مەڕێك دەخوات کە دوور کەوتبێتەوە و دابڕابێت لە ڕان**.

---

[45] انظر : تاریخ بغداد : (٩ / ٣٦١).

[46] أخرجه أحمد : (٥ / ١٩٦) و (٦ / ٤٤٦) وأبو داود : (١/ ٣٧ ـ ح ٥٤٧) والنسائي : (٢ / ١٠٦) ، وحسنه الألباني في صحيح سنن النسائي : (١/١٨٤).

* بۆ تێگەیشتن لە زاراوەی (الجماعة : کۆمەڵی موسڵمانان) و ئاشنا بوون بە واتا ڕاست و ڕەسەنەکەی کە لە چەندین فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە ئەوا پێویستە ئەم کتێبە بخوێنیتەوە : (فەتوای گەورە زانایان .. سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی حوکمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچە پارچەکردنی ...) لاپەڕە : (١٤٩ ـ ١٥٤) لە نووسین و ئامادەکردنی وەرگێڕ.

١٥- بەڕاستی هاوەڵە چاکەکانی هاوڕێیەتی و برایەتی یەکتر کردن لە بەر خوا هۆکارێکە بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوای

---

** مەبەستی ئەوەیە ئەگەر موسڵمانان هۆشیار نەبن لە کۆمەڵی موسڵمانان ئەوا خەسڵەتەکان بە ڕەمەکی و ناڕاستەوخۆیی بیدعە و تاوانەکان هەڵدەخڕێنن و لە سەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام لای دەدەن و گومڕای دەکەن و لە ناوی دەبەن، بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم خاڵە ئەم فەرموودەیەت بۆ باس دەکەم :

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَالَ : خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) خَطًّا ثُمَّ قَالَ : هَذَا سَبِيلُ اللهِ ، ثُمَّ خَطَّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ ثُمَّ قَالَ : هَذِهِ سُبُلٌ مُتَفَرِّقَةٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ ، ثُمَّ قَرَأَ : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [رواه أحمد والنسائي والدارمي وحسنه الألباني في مشكاة المصابيح رقم : (١٦٦)] .

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێڵێکی بۆمان کێشا و ئەوجا فەرمووی: ئەمە ڕێگا ڕاستەکەی خوایە ، پاشان چەند هێڵێکی تری بە لای ڕاست و چەپی ئەو هێڵە ڕاستەدا کێشا و ئەوجا فەرمووی : ئەمانە چەند ڕێچکەیەکی پەرتەوازەن ، هەر ڕێچکەیەکیان شەیتانێکی لە سەرە و بانگەوازی بۆ دەکات ، ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە : (بەڕاستی ئەمە ڕێگا ڕاستەکەی منە و شوێنی کەون ؛ وە شوێنی ڕێچکەکان مەکەون چونکە لە ڕێگاکەی خوا لاتان دەدات) ..

کەواتە : بە شوێنکەوتنی ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام ئەوا کۆمەڵی موسڵمانانی لەبیرە و لانەکردنەوە و لانەدان بۆ لای ڕێچکە کورتە پەرتەوازەکانی لای ڕاست و چەپی ڕێگای ڕاست پارێزراو دەبێت لە شەیتانەکانی سەر ئەو ڕێچکە کورتانە !

گەورە ، هەر وەك چۆن لە فەرموودەیەکی قودسیدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : خوای کار پڕ بەرەکەت و گەورە فەرموویەتی :

((وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ ، وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ))[٤٧].

واتە : **خۆشەویستی خۆمم جێگیر کردووە** بۆ ئەمانە :

لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ : ئەوانەی کە لە بەر من یەکتریان خۆش دەوێت .

وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ : ئەوانەی کە لە بەر من لەگەڵ یەکتردا دادەنیشن و مەجلیس دەگێڕن .

وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ : ئەوانەی کە لە بەر من سەردانی یەکتر دەکەن .

وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ : ئەوانەی کە لە بەر من شت بە یەکتر دەبەخشن .

وە لەفزێکی تردا هاتووە : ((قَدْ حَقَّتْ مَحَبَّتِي لِلَّذِينَ يَتَحَابُّونَ مِنْ أَجْلِي ، وَقَدْ حَقَّتْ مَحَبَّتِي لِلَّذِينَ يَتَزَاوَرُونَ مِنْ أَجْلِي ، وَقَدْ حَقَّتْ مَحَبَّتِي لِلَّذِينَ يَتَبَاذَلُونَ مِنْ أَجْلِي ، وَقَدْ حَقَّتْ مَحَبَّتِي لِلَّذِينَ يَتَصَادَقُونَ مِنْ أَجْلِي))[٤٨].

---

[٤٧] موطأ مالك : (٢ / ٩٥٣) وصحّح إسناده ابن عبد البر والنووي في رياض الصالحين رقم : (٣٨٧) والمنذري في الترغيب والترهيب : (٣/ ٢٤٠) ، وقال الألباني : صحيح "صحيح الجامع الصغير" رقم : (٤٣٣١) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣٠١٨) و (٢٥٨١) .

[٤٨] قال المنذري في الترغيب : (٤ / ٤٧) : رواه أحمد ورواته ثقات والطبراني في الثلاثة واللفظ له والحاكم وقال : صحيح الإسناد ، وقال الدمياطي في المتجر الرابح ص :

وتە : بە دڵنیایی خۆشەویستی خۆمم پێویست کردووە بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی مندا یەکتریان خۆشدەوێت ، وە خۆشەویستی خۆمم پێویست کردووە بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی مندا سەردانی یەکتر دەکەن ، وە خۆشەویستی خۆمم پێویست کردووە بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی مندا شت بە یەکتر دەبەخشن ، وە خۆشەویستی خۆمم پێویست کردووە بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی مندا هاوڕێیەتی و برادەرێتی یەکتر دەکەن .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى ، فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكاً ، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ : أَيْنَ تُرِيدُ ؟ قَالَ : أُرِيدُ أَخاً لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ ، قَالَ : هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا ؟ قَالَ : لاَ غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ، قَالَ : فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ))[٤٩].

وتە : پیاوێك سەردانی برادەرێکی خۆی کرد لە گوندێکدا ، جا خوای گەورە فریشتەیەکی نارد بۆ سەر ڕێگاکەی و کاتێك هات بۆ لای پێی ووت : بۆ کوێ دەچیت ؟

---

(٥٣٥) : رواه أحمد بإسناد صحيح ، ورواه أحمد أيضاً عن عبادة بن الصامت بسند صححه المنذري والدمياطي في الموضعين المشار إليهما .

[٤٩] صحيح مسلم رقم : (٢٥٦٧) .

ئەویش ووتی : بۆ لای برادەرێكم دەچم لەم گوندەدا .

فریشتەكە ووتی : ئایا هیچ مافێكی دنیاییت بە سەریەوە هەیە لێی وەرگریتەوە (یان هیچ بەرژەوەندیەكت هەیە لە گەڵیدا پێی هەڵسیت)؟

ئەویش ووتی : نەخێر ، تەنها ئەوە نەبێت كە مـن لـە بـەر خـوای گەورە خۆشیم دەوێت .

فریشتەكەش ووتی : جا من نێردراوی خوام بۆ لای تـۆ بـۆ ئـەوەی پێت ڕاگەیەنم كە خواش تۆی خۆش دەوێت وەك چۆن تۆ ئەوت لە بەر خاتری خوا خۆش دەوێت .

١٧ ـ بەڕاسـتی كـۆڕ و مەجلیـسی پیاوچـاكان كـۆڕ و مەجلیـسی زیكری خوای گەورەیە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لاَ يَقْعُدُ قَــوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ ، وَنَزَلَــتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ))[٥٠].

واتە : هـیچ كۆمەڵـە كەسـێك نـیـیە كۆببنـەوە و دانیـشن زیكـری خوای گەورە بكەن ئیللا فریشتەكـان دەوریـان دەگـرن و ڕەحمـەتی خوا دەیانگرێتەوە و ئارامی دادەبەزێتە سەر سەریان و خوای گـەورە باسیان دەكات لای ئەوانەی كە لە لای خۆیدان .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَا مِنْ قَوْمٍ اجْتَمَعُوا يَذْكُرُونَ

---

[٥٠] صحيح مسلم رقم : (٢٧٠٠) .

اللَّهَ لا يُرِيدُونَ بِذَلِكَ إِلاَّ وَجْهَهُ إِلاَّ نَادَاهُمْ مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ أَنْ قُومُوا مَغْفُوراً لَكُمْ قَدْ بُدِّلَتْ سَيِّئَاتُكُمْ حَسَنَاتٍ»[٥١].

واتە : هیچ كۆمەڵە كەسێك نییە كۆببنەوە و زیكری خوا بكەن و مەبەستیشیان بەوە هیچ نەبێت ئیللا پاداشتی خوا نەبێت ئیللا بانگ كەرێك لە ئاسمانەوە بانگیان دەكات و دەڵێت : هەستن خوا لێتان خۆش بووە و تاوانەكانتانی بۆ گۆڕیونەتەوە بە چاكە .

١٨ ـ مرۆڤ بە سەردان كردنی برادەرەكانی لە بەر خوا دەروون و ڕێڕەوی هەنگاوەكانیشی پاك دەكاتەوە و پلە و پایەی گەورە بۆ خۆی مسۆگەر دەكات لە بەهەشتدا ، هەر وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : «مَنْ عَادَ مَرِيضاً أَوْ زَارَ أَخاً لَهُ فِي اللَّهِ نَادَاهُ مُنَادٍ : أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلاً»[٥٢].

واتە : هەر كەسێك سەردانی نەخۆشێك یان سەردانی برادەرێكی بكات لە بەر خاتری خوا ، ئەوا بانگ كەرێك بانگی دەكات و دەڵێت : خوا پاكت بكاتەوە و ڕێگای خێر و چاكەتیش بۆ پاك بكاتەوە و جێگایەكتیش بۆ ئامادە بكات لە بەهەشتدا .

وَعَنْ أَنَسٍ (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : «مَا مِنْ عَبْدٍ أَتَى أَخَاهُ يَزُورُهُ فِي اللَّهِ

---

[٥١] رواه أحمد : (١٤٢/٣) وقال الألباني : هذا إسناد حسن إنْ شاء الله "الصحيحة" رقم : (٢٢١٠) ، وذكره في صحيح الجامع بنحوه وصحَّحه : (٩٨١/٢) .

[٥٢] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٠٠٨) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٢٥٧٨) .

إلاَّ نَادَاهُ مَلَكٌ مِنَ السَّمَاءِ : أَنْ طِبْتَ وَطَابَتْ لَكَ الْجَنَّةُ ، وَإِلاَّ قَالَ اللَّهُ فِي مَلَكُوتِ عَرْشِهِ : عَبْدِي زَارَ فِيَّ ، وَعَلَيَّ قِرَاهُ ، فَلَمْ أَرْضَ لَهُ بِثَوَابٍ دُونَ الْجَنَّةِ)) [٥٣].

واتە : هیچ بەندەیەك نییە سەردانی برایەکی بکات لە بەر خوا ئیللا بانگ کەرێك بانگی دەکات لە ئاسمانەوە و دەڵێت : ئەوا پاك بویتەوە و بەهەشتیشت بۆ خۆشکرا ، وە ئیللا خوای گەورە لە مولکی عەرشیدا دەفەرموێت : عەبدەکەم لە پێناوی مندا سەردانی برایەکی کرد و میواندارییەکەی لە سەر من ، وە بە هیچ پاداشتێك ڕازی نابێت بۆی جگە لە بەهەشت نەبێت .

وَعَنْ أَنَسٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((أَلا أُخْبِرُكُمْ بِرِجَالِكُمْ فِي الْجَنَّةِ ؟ قَالُوا : بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ : النَّبِيُّ فِي الْجَنَّةِ ، وَالصِّدِّيقُ فِي الْجَنَّةِ ، وَالرَّجُلُ يَزُورُ أَخَاهُ فِي نَاحِيَةِ الْمِصْرِ فِي الْجَنَّةِ لا يَزُورُهُ إِلاَّ لِلَّهِ فِي الْجَنَّةِ)) [٥٤].

---

[٥٣] كشف الأستار عن زوائد البزار ـــ كتاب البر والصلة ـــ باب الزيارة : (٢/٣٨٨ ـــ ح ١٩١٨) ، ومسند أبي يعلى : (٧ / ١٦٦ ـــ ح ٤١٤٠) ، قال المنذري في الترغيب : (٣/ ٢٣٩) والدمياطي في المتجر الرابح ص : (٥٣٤) : "رواه البزار وأبو يعلى بإسناد جيد" وقال الهيثمي في مجمع الزوائد : (٨ / ١٧٣) : "رواه البزار وأبو يعلى ورجال أبي يعلى رجال الصحيح غير ميمون بن عجلان وهو ثقة" ، وقال الألباني في صحيح الترغيب والترهيب : (٢٥٧٩) : "حسن صحيح" .

واتە : ئایا هەواڵتان نەدەمێ بە پیاوانتان لە بەهەشتدا ؟ وتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : پێغەمبەر لە بەهەشتدایە ، ڕاستگۆ لە بەهەشتدایە ، وە پیاوێك سەردانی برایەکی بکات لە پەڕی شارەوە سەردانی نەکات ئیللا لە بەر خوا نەبێت لە بەهەشتدایە .

١٩ ـ بە گشتی هاوەجلیس و برادەری چاك و صالح سوودی بۆت هەیە لە هەموو ڕوویەکی دین و دونیاوە ، هەر وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : «الْمُؤْمِنُ إِنْ مَاشَيْتَهُ نَفَعَكَ ، وَإِنْ شَاوَرْتَهُ نَفَعَكَ ، وَإِنْ شَارَكْتَهُ نَفَعَكَ ، وَكُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِهِ مَنْفَعَةٌ»[٥٥].

واتە : ئیماندار ئەگەر لە گەڵیدا ڕێبکەیت سوودت پێدەگەیەنێت ، وە ئەگەر پرس و ڕای پێبکەیت سوودت پێدەگەیەنێت ، وە ئەگەر شەریکی بکەیت سوودت پێدەگەیەنێت ، وە هەموو شتێك لە کارەکانیدا سوودی تێدایە .

---

[٥٤] المعجم الصغير للطبراني : (١ / ٤٦) ، قال الدمياطي في المتجر الرابح ص : (٣٤٥) : "إسناده جيد إن شاء الله" ، وأخرجه الطبراني أيضاً بلفظ مقارب من حديث كعب بن عجرة في المعجم الكبير : (١٩ / ١٤٠ ح ٣٠٧) وحسنه الألباني في صحيح الجامع رقم : (٢٦٠٤) .

[٥٥] رواه أبو نعيم في الحلية : (٨ / ١٢٩) وقال : ثابت صحيح عن النبي (ﷺ) من حديث ابن عمر . [قلتُ : ضعفهُ الإمام الألباني في ضعيف الجامع الصغير رقم : (٥٩٠٥) وسلسلة الأحاديث الضعيفة رقم : (٤٦٧٠)] .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَثَلُ الْمُؤْمِنِ مَثَلُ النَّخْلَةِ ، مَا أَخَذْتَ مِنْهَا مِنْ شَيْءٍ نَفَعَكَ))[٥٦].

واتە : نموونەی ئیماندار وەك دار خورمایە هەر شتێكی لێببەیت سوودت پێدەگەیەنێت .

٢٠ ـ وە لە بەرهەمەكانی هاومەجلیس و برادەری چاك ئەوەیە دەبێتە هۆی خۆشەویستییان لە پێناوی خوادا ، جا هەر وەكو چۆن خۆشەویستی هاومەجلیسێتی و هاوڕێیەتی بەرهەم دێنێت هەروەها هاومەجلیسێتی و هاوڕێیەتیش خۆشەویستی بەرهەم دێنێت .

وە خۆشەویستی لە پێناوی خوا چەندین بەرهەم و شوێنەوار و كاریگەری گەورەی هەیە لە سەر دەروونەكان ، وە خوای گەورە پاداشتی زۆر گەورەی داناوە بۆی ، جا لە بەر زۆری ئەو خێر و چاكە و بەرهەم و شوێنەوارانە بە جیا باسیان دەكەم :

---

[٥٦] رواه الطبراني في المعجم الكبير : (١٢ / ٤١١) من حديث ابن عمر وصحّحه الألباني في صحيح الجامع رقم : (٥٨٤٨) .

وأصل الحديث في الصحيحين بلفظ : ((إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا ، وَإِنَّهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ ، فَحَدِّثُونِي مَا هِيَ ؟ ... ثُمَّ قَالَ : هِيَ النَّخْلَةُ)) صحيح البخاري رقم : (٦١) وصحيح مسلم رقم : (٢٨١١) .

واتە : دارێك هەیە لەناو دارەكاندا گەڵاكەی ناوەرێت و بەڕاستی وەكو موسڵمان وایە ، پێم بڵێن : كام دارەیە ؟ ... ئەنجا فەرمووی : دار خورمایە .

# بەرهەم و چاکەکانی خۆشەویستی لە پێناوی خوا

أ / خۆشەویستی لە پێناوی خوا هۆکارێکە بۆ ئەوەی خوا خۆشتی بوێت .

پێش کەمێك ئەو فەرموودەیەمان باس کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : خوای گەورە فەرموویەتی : ((وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ ...)).

واتە : **خۆشەویستی خۆمم جێگیر کردووە** بۆ ئەمانە :

(لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ) : ئەوانەی کە لە بەر من یەکتریان خۆش دەوێت ،

(وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ) : ئەوانەی کە لە بەر من لەگەڵ یەکتردا دادەنیشن و مەجلیس دەگێڕن ...

وە ووتەی فریشتەکە بەو پیاوەی کە سەردانی برادەرەکەی کرد لە بەر خوا : ((إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ))[٥٧].

واتە : من نێردراوی خوام بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی پێت ڕابگەیەنم کە خواش تۆی خۆش دەوێت وەك چۆن تۆ ئەوت لە بەر خاتری خوا خۆش دەوێت .

---

[٥٧] صحيح مسلم رقم : (٢٥٦٧) .

وَعَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ) يَرْفَعُهُ (ﷺ) قَالَ : ((مَا مِنْ رَجُلَيْنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ إِلاَّ كَانَ أَحَبُّهُمَا إِلَى اللَّهِ أَشَدَّهُمَا حُبًّا لِصَاحِبِهِ))(٥٨).

واتە : هیچ دوو پیاوێك نی‌یە لە پەنهانیدا* یەکتریان خۆش بوێت لە بەر خوا ئیللا خۆشەویست ترینیان لای خوا ئەوەیانە کە هاوڕێکەی زیاتر خۆش دەوێت .

ب / خوای پاك و بێ‌کەموکوڕی و گەورە ئەوانەی کە یەکتریان خۆش دەوێت لە بەر خوا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری عەرشی خوا نەبێت .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : ((سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ)) ... فذكر منهم : ((وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ))(٥٩).

واتە : یەکێك لەو حەوت کەسانەی کە خوا لە ڕۆژی دوایدا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە کە هیچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری عەرشی خوا نەبێت ... دوو پیاون کە لە بەر خاتری خوا

---

(٥٨) رواه الطبراني في المعجم الأوسط كما في مجمع الزوائد : (١٠ / ٢٧٦) ، وقال المنذري في الترغيب : رواه الطبراني بإسناد جيد قوي ، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب : (٣٠١٦) .

* واتە : خۆشەویستیەکە تەنها سەرزاری و ڕواڵەتی نی‌یە .

(٥٩) صحيح البخاري رقم : (٦٦٠) وصحيح مسلم رقم : (١٠٣١) .

یەکتریان خۆش دەوێت و لە سەر ئەوەش کۆ دەبنەوە و لە سەریشی جیا دەبنەوە .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ : أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلَالِي ؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلِّي))[٦٠].

واتە : خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمویت : کوان ئەوانەی کە لە بەر گەورەیی من یەکتریان خۆشدەویست ؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەری عەرشمەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێک نییە تەنها سێبەری عەرشی من نەبێت .

ج / خۆشەویستی لە بەر خوا و ڕق لێبوون لە بەر خوا نیشانەی بەلگەیە لە سەر تەواوێتی ئیمانی بەندە .

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ : ((مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ ، وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ))[٦١].

واتە : هەر کەسێک خۆشەویستی (بۆ کەسێک یان شتێک) لە بەر خوا بێت وە ڕق لێبوونی (بۆ کەسێک یان شتێک) لە بەر خوا بێت ، وە

---

[٦٠] صحيح مسلم رقم : (٤ / ١٩٨٨) رقم : (٢٥٦٦) .

[٦١] سنن أبي داود : (٥ / ٦٠ ح ٤٦٨١) وصححه الألباني في صحيح الجامع رقم : (٥٩٦٥) .

شت بەخشین و شت گرتنەوەیشی لە بەر خوا بێت ئەوا بەڕاستی ئەو كەسە ئیمانی كامڵ و تەواوە .

د / بەڕاستی خۆشەویستی لە بەر خوا هۆكارێكە بۆ چێژكردنی تام و شیرینی ئیمان .

عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ : «ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِـــنَّ حَلَاوَةَ الإيـــمَانِ : أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا ســوَاهُمَا ، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْــرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ»[١٢] .

واتە : سێ خەسڵەت و كردار هەیە لە هەر كەسێكدا هەبێت ئەوا تام و چێژی شیرینی ئیمانی كردووە :

ـ دەبێت خوا و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) لە لا خۆشەویست تر بێت لە هەموو كەسێك جگە لەوان .

ـ وە دەبێت ئەو كەسەی كە خۆشی دەوێت خۆشی نەوێت تەنها لە بەر خوا نەبێت .

ـ وە دەبێت پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە ناو كوفر و بێباوەڕی وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە .

هەروەها پێغـــەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَجِدَ طَعْمَ

---

[١٢] صحيح البخاري رقم : (١٦) وصحيح مسلم رقم : (٤٣) .

الإيمان فليحب المرء لا يحبه إلا لله عز وجل»[٦٣]

واتە : هەر کەسێک پێی خۆشە تام و چێژی ئیمان بکات ئەوا با مرۆڤی خۆش بوێت تەنها لە بەر خوای گەورە.

هـ / بەڕاستی مرۆڤ بە خۆشویستنی چاکەکاران لە بەر چاکێتی و دامەزراوێتیان لەسەر خواپەرستی و دینداریی پێیان دەگات و دەشگاتە پلەی ئەوان، ئەگەر چی بە کردەوەش نەگەیشتبێتە ئاستی ئەوان.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَقُولُ فِي رَجُلٍ أَحَبَّ قَوْمًا وَلَمْ يَلْحَقْ بِهِمْ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ))[٦٤]

واتە : پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا چی دەفەرموێت سەبارەت بە پیاوێک کە خەڵکانێکی خۆش بوێت و نەشگەیشتووەتە پلەی ئەوان ؟

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە

[٦٣] مسند أحمد : (٢ / ٢٨٩)، وكشف الأستار عن زوائد البزار : (١ / ٥٠ ح ٦٣)، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد : (١ / ٩٠) : "رواه أحمد والبزار ورجاله ثقات"، ورواه الحاكم : (٤ / ١٦٨) وقال : صحيح الإسناد ولم يخرجاه وأقره الذهبي، وحسنه الألباني في صحيح الجامع : (٥٩٥٨).

[٦٤] صحيح البخاري رقم : (٦١٦٩)، وصحيح مسلم رقم : (٢٦٤٠).

کە خۆشی دەوێت .

وَعَنْ أَنَسٍ (ﷺ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ ؟

قَالَ : ((مَا أَعْدَدْتَ لَهَا)) ؟

قَالَ : مَا أَعْدَدْتُ لَهَا مِنْ كَثِيرِ صَلاَةٍ وَلاَ صَوْمٍ وَلاَ صَدَقَةٍ ، وَلَكِنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ .

قَالَ : ((أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)) .

قَالَ أَنَسٌ : فَمَا فَرِحْنَا بِشَيْءٍ فَرَحَنَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ) : ((أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)) ، قَالَ أَنَسٌ : فَأَنَا أُحِبُّ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ بِحُبِّي إِيَّاهُمْ ، وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِمِثْلِ أَعْمَالِهِمْ [٦٥] .

واتە : پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خوا کەی قیامەتە ؟

فەرمووی : چیت بۆ قیامەت ئامادە کردووە ؟

وتی : شتێکی وا تۆزۆر لە نوێژ و ڕۆژوو و صەدەقەم ئامادە نەکردووە بەڵام من خوا و پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت .

ئەنەس فەرمووی : بە هیچ شتێك دڵخۆش نەبووین بە ئەندازەی دڵخۆشیمان بەم وتەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی : تۆ لەگەڵ ئەو

[٦٥] صحيح البخاري رقم : (٣٦٨٨) و (٦١٧١) و (٧١٥٣) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٣٩) وهو عند غيرهما بألفاظ متعددة .

کەسەدایت کە خۆشت دەوێت .

جا لە بەر ئەمە من پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبو بەکر و عومەرم خۆشدەوێت ، وە ئومێدەوارم کەوا لەگەڵ ئەواندا بم بە خۆشەویستیم بۆیان* ، ئەگەر چی کردەوەشم نەکردبێت وەك کردەوەکانی ئەوان .

وَعَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ : (ﷺ) : ((لا يُحِبُّ رَجُلٌ قَوْمًا إِلاَّ حُشِرَ مَعَهُمْ))[٦٦].

واتە : هیچ پیاوێك نییە کەسانێکی خۆش بوێت ئیللا لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت .

و / لە سوودەکانی خۆشەویستی لە بەر خوا : خوای گەورە ڕێز دەگرێت لە کەسێك کەوا کەسێکی تری خۆش بوێت لە بەر خوا :

---

* ئەمەیە قوتابی ڕاستەقینەی پەروەردەکراوی قوتابخانەی پێغەمبەرایەتی و ئیسلامی ڕەسەن ، بەڵام بەداخەوە ئەوەی کە لەم ڕۆژگارەدا دەبیسترێت و دەبینرێت لە ئەوەی ئەم سەردەمەدا خۆشەویستی دەربڕین و سەرسام بوونە بە گۆرانیبێژ و ڕۆمان نووس ... و یاریزانە بێباوەڕ و گومڕاکانەوە کە ناو هێنان و باس کردنی ژیاننامە و هەڵویستەکانیان بووەتە ویردی سەر زاری زۆربەی هەرە زۆری لاوەکانی سەردەمی ئاخر زەمان !!!

ئایا پێت خۆشە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەمانەدا بیت و لەگەڵیاندا حەشر بکرێیت ؟!!! - وەرگێڕ -

[٦٦] رواه الطبراني في المعجم الصغير : (٢ / ٤٠) وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣٠٣٧) .

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (ﷺ) قَال : قَال رَسُول الله : (ﷺ) : ((مَا أَحَبَّ عَبْدٌ عَبْداً لِلّهِ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ أَكْرَمَهُ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ))[٦٧].

واتە : هیچ عەبدێك نییە عەبدێكی تری خۆش بوێت لە بەر خوا ئیللا خوا ڕێزی لێدەگرێت .

وە ڕێز گرتنی خوا لە مرۆڤێك ڕێز لێگرتنی بە پێبەخشینی ئیمان و زانستی بەسوود و كردەوەی چاك و هەموو جۆرە نیعمەتەكان دەگرێتەوە .

ز / ئەوانەی كە یەكتریان خۆش دەوێت لە بەر خوا مینبەری نووورانیان هەیە و پێغەمبەران و شەهیدانیش خۆزگەیان پێدەخوازن لە ڕۆژی قیامەتدا :

عَنْ مُعَاذ بْنِ جَبَلٍ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّه (ﷺ) : ((قَالَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ : الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلاَلِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ))[٦٨].

---

[٦٧] رواه ابن أبي الدنيا في كتاب الإخوان ص : (١٠٤) رقم : (٢٠) والمقدسي في كتاب المتحابين في الله ص : (٢٧) رقم : (٨) واللفظ لهما ، ورواه أحمد في المسند :.(٥ / ٢٥٩) بلفظ : " إِلاَّ أَكْرَمَ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ " ، وقال الألباني عن إسناد الحديث : "هذا إسناد شامي جيد" الصحيحة رقم : (١٢٥٦) وحسنه السيوطي والمناوي "فيض القدير" : (٥ / ٤١٠) .

[٦٨] سنن الترمذي رقم : (٢٣٩٠) وصححه الألباني في صحيح الجامع رقم : (٤٣١٢) .

واتە : خوای گەورە فەرموویەتی : ئەوانەی كە لە بەر گەورەیی من یەكتریان خۆشدەوێت مینبەریان هەیە لە نور و پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێدەخوازن لە ڕۆژی قیامەتدا .

دوای ئەوەی بەرهەمەكانی دانیشتن و مەجلیسگێرانمان لەگەڵ چاكەكاراندا زانی و بۆمان ڕوون بوویەوە كەوا هاوەجلیس و برادەری چاك سوودگەیەنەرە بەوەی كە لە گەڵیدا دادەنیشێت لە چەندین لایەنەوە لە بواری دونیا و دینەوە ..

ئەنجا دەڕۆینە سەر باسی لایەنی بەرامبەر كە بریتییە لە :

هاوەجلیس و برادەری خراپ ، بۆ ئەوەی بزانین دانیشتن و دۆستایەتی كردن لە گەڵیدا دەبێتە هۆی تێكچوون و بەدبەختی و نەهامەتی دونیا و قیامەت .

﴿شاعیرێك وتویەتی :

عَرفتُ الشرَّ لا للشــــــرِّ لكنْ لتوَقِّيه

ومَنْ لا يَعْرِفُ الــخيرَ مِنَ الشرِّ يَقَعْ فـيهِ

واتە : خراپەم ناسیەوە نەك لە بەر ئەوەی خراپەیە بەڵكو بۆ ئەوەی خۆمی لێبپارێزم ..

چونكە هەر كەسێك چاكە و خراپە لە یەك جیا نەكاتەوە ئەوا دەكەوێتە ناو خراپەوە﴾* .

---

* ئەمەی نێوان كەوانەكە من بۆیم زیاد كردووە ـ وەرگێڕ .

# زەرەر و زیانەكانی هاوەجلیس و برادەری خراپ

هاوەجلیس و برادەری خراپ زیان دەگەیەنێت بە هاوڕێكەی لە هەموو ڕوویەكەوە ، وە بەدبەختی‌یە بۆی لە دونیا و قیامەتدا .

كۆكردنەوەی هەموو ئەو زیان و زەرەرانەی كە لە دەرئەنجامی دانیشتن و برادەرێتی كردنی خراپەكاران بە دەست دێت نارەحەتە ، جا لەولەنیە باسكردنی هەندێكیان بەس بێت بۆ وریاكردنەوەی كەسانی ژیر و عاقڵ لەم جۆرە دانیشتن و هاوڕێیەتی كردنە :

١ ـ لە زیانەكانی هاوەجلیس و برادەری خراپ ئەوەیە كە بەڕاستی گومانت بۆ دروست دەكات لە بیروباوەڕە ڕاستەكانتدا و لاتدەبات لە سەری ، هەر وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَئِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾﴾ [سورة الصافات] .

واتە : دۆزەخیەكان هەندێكیان ڕوو دەكەن لە هەندێكیان و پرسیار دەكەن : قسەكەرێكیان دەڵێت بەڕاستی من برادەرێكم هەبوو پێمی دەگوت : ئایا تۆ لەولەنەی كە باوەڕت بە خوا هەیە و ڕۆژی قیامەت بە ڕاست دەزانیت ؟ ئایا ئەگەر ئێمە بمرین و ببین بە خۆڵ و ئێسقان ئایا ئێمە پاداشت دەدرێینەوە ؟!

وە گوێ بگرە بۆ بەسەرهاتی مردنی (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر كوفر و ئەو ڕۆڵەی كە هاوەڵەجلیس و برادەری خراپ پێی هەستا لە مردنیدا لە سەر ئەو حاڵە . ↵

عَنْ عَنْ سَعِيد بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ الْمُسَيَّبِ بْنِ حَزْنٍ قَالَ : ((لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لأَبِي طَالِبٍ : يَا عَمِّ قُلْ : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ .

فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ : يَا أَبَا طَالِبٍ أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ؟!

فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ ، وَيَعُودَانِ بِتِلْكَ الْمَقَالَةِ ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ : هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ))[٦٩].

واتە : كاتێك (أبو طالب) گەیشتە حاڵەتی سەرەمەرگ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لای و بینی (أبو جهل و عبدالله بن أبي أمية) لە لاین ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی مامە بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) وتەیەكە شایەتی پێدەدەم بۆت لە لای خوا لە قیامەتدا ، (أبو جهل و عبدالله

---

[٦٩] صحيح البخاري في مواضع متعددة ، وهذا اللفظ برقم : (١٣٦٠) وصحيح مسلم رقم : (٣٤) .

بن أبي أمية)ش وتیان : ئەی (أبو طالب) ئایا پشت هەڵدەکەیت لە دینی (عبد المطلب)ی باوکت ؟! پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام پێی دەفەرموو : بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ، (أبو جهل و عبد الله بن أبي أمية)ش ئەو قسەیەیان دووبارە دەکردەوە ، تاوەکو دواین وتەی (أبو طالب) ئەوەبوو کە وتی : ئەو لە سەر دینی عبد المطلب دەمرێت ، و خۆی گرتەوە لەوەی کە بڵێت (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) !

برام بڕوانە ئەو دوو هاوەجلیس و برادەرە خراپانە چیان کرد ، (أبو طالب)یان کۆمڕا کرد لە ژیانیدا و بەردەوامیش بوون لە گەڵیدا تاوەکو سپاردیان بە ئاگری جەهەننەم ، پەنا بە خوا .

٢ ـ بەڕاستی هاوەجلیس و برادەری خراپ بانگی هاوڕێکەی دەکات بۆ چاولێکردی خۆی لە کەوتنە ناو حەرام و تاوانەکان ، وە ئەوەشی پێخۆشە بۆی ! هەر وەك چۆن شێخی ئیسلام (ابن تیمیــة) رەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (زۆرینەی خراپەکاران ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت کەوا لەگەڵیاندا دەسازێن و پێکدێن لە سەر ئەوەی کە خۆیان تێیدان ، وە رقیشیانە لەوانەی کە ناسازێن و ناگونجێن لەگەڵیاندا .

هەروەها لە بوارەکانی دونیا و ئارەزووەکاندا زۆر جارێك ئەوانە هەڵدەبژێرن و پێشدەخەن کەوا بەشدارییان لە گەڵدا دەکەن : یان بە مەبەستی یارمەتی دلن لە سەر ئەوە وەك چۆن لە زاڵبوناندا لە خاوەن

دەسەڵاتەکان و جەردە و ڕێگرەکان و هاوشێوەکانیاندا هەیە ، یان بە مەبەستی خۆگونجان وەك چۆن لەوانەدا هەیە کە کۆبوونەتەوە بۆ عارەق خواردنەوە ، چونکە بەڕاستی ئەوانە هەموو ئەو کەسانە هەڵدەبژێرن کە ئامادە دەبن لەگەڵیاندا بۆ خواردنەوە ، وە یان لە بەر ئەوەیە کە پێیان ناخۆشە ئەو لێیان جیاببێتەوە بە چاکەکردن ، یان لە بەر حەسوودی و چاوچنۆکییە لە سەر ئەوە ، بۆ ئەوەی ئەو بەرز نەبێتەوە بە سەریاندا بەو کارە و دەست خۆشی لێنەکرێت جگە لەوان ، وە یان لە بەر ئەوەیە کە نەبێتە بەڵگە و شایەت حاڵ بە سەریانەوە ، وە یان لە بەر ئەوەیە کە دەترسن تۆڵەیان لێبسێنێتەوە بە خوودی خۆی یان بە بەرزکردنەوەی شکایەت لە سەریان ، وە بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر مننەت کردن و مەترسیەکانیەوە ، یان لە بەر هاوشێوەکانی ئەم هۆکارانە .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ﴿١٠٩﴾ ﴾ [سورة البقرة] .

واتە : زۆربەی گاور و جوولەکە ئومێدی ئەوە دەکەن و پێیان خۆشە کەوا ئێوەی ئیماندار هەڵگەڕێنەوە لە ئیسلام دوای ئەوەی کە باوەڕتان هێنا و ببن بە کافر و بێباوەڕ لە بەر حەسادەتی خۆیان

دوای ئەوەی کەوا حەق و ڕاستیان بۆ ڕوون بوویەوە .

وە سەبارەت بە دووڕووەکان فەرموویەتی : ﴿وَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا۟ فَتَكُونُونَ سَوَآءً ۝٨٩﴾ [سورة النساء] .

دووڕووەکان ئومێدی ئەوە دەکەن و پێیان خۆشە کەوا ئێوەی ئیماندار کوفر بکەن و بێباوەڕ بن هەر وەکو چۆن ئەوان خۆیان کوفریان کردووە بۆ ئەوەی ئێوە و ئەوان یەکسان بن لە بێباوەڕیدا .

وە (عثمان ﷺ) فەرموویەتی : "ودّت الزانية لـو زنـى النسـاء كلهن".

واتە : ئافرەتی داوێن پیس پێی خۆشە هەموو ئافرەتان داوێن پیس بن)[٧٠].

٣ ـ بەڕاستی مرۆڤ بە سروشتی خۆی کاریگەر دەبێت بە داب و خوو و ڕەوشت و کردەوەکانی هاوەڵ و جلیس و برادەرەکەی ، لە پێشەوە باسی ئەو فەرموودەیەمان کرد کەوا پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا فەرمووی : ((الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ))[٧١].

واتە : مرۆڤ لە سەر دینی خۆشەویستەکەیەتی ، جا با یەکێك لە ئێوە بڕوانێت بۆ ئەوەی بزانێت کێی خۆش دەوێت ؟

---

[٧٠] مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام ابن تيمية : (٢٨ / ١٥٠ ـــ ١٥١) .

[٧١] بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١١) .

جا ئەگەر هاومەجلیس و برادەرەکەت خراپ بوو ئەوا مرۆڤ پێ‌ی کاریگەر دەبێت و ڕەنگی ئەوی لێدەنیشێت .

هەندێك وتویانە : (إيَّاكَ ومُجالَسةَ الشريرِ فإنَّ طبعكَ يسرِقُ من طبعه وأنت لا تدري)[٧٢].

واتە : ئامان وریابە لە دانیشتن و هاوڕێیەتی کردنی خراپەکار چونکە بەڕاستی خووی تۆ دزی دەکات لە خووی ئەو و تۆش نازانیت و ئاگات لێی نییە .

٤ ـ بەڕاستی بینینی هاومەجلیس و برادەری خراپ تاوان کردنت بیر دەخاتەوە جا پێیەوە دیار بێت یا خود شاراوە بێت یەکسانە ، ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت کە تۆ ئاگات هەبێت لە تاوانەکانی ، بە هۆی ئەو بینینەوە خەتەرەی تاوان کردن دێت بە مێشکی مرۆڤدا دوای ئەوەی کە ئەو بێ‌ئاگا بووە لێی یان سەرقاڵ بووە و بە بیریدا نەهاتووە ، جا هەر وەك چۆن بینینی کەسێکی گوێڕایەڵ و صالح کە خوا یارمەتی داوە بۆ چاکەکاری خوات بیر دەخاتەوە ئاوەهایش بینینی کەسێکی تاوانبار کە شەیتان ڕایکێشاوە بۆ تاوان کردن شەیتانت بیر دەخاتەوە .

---

(٧٢) الذريعة إلى مكارم الشريعة للراغب الأصفهانـي ص : (٢٩٥).

(الراغب الأصفهاني) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : تێپەڕاندنی خووڕەوشتی هاوەجلیس و برادەر بۆ برادەرەکەی تەنها بە گوفتار و کردارەوە ناوەستێتەوە ، بەڵکو بە تێڕوانینیشی هەمان کاریگەری دەبێت ، چونکە تێڕوانین بۆ وێنە و ڕووخسار کاریگەری دەکاتە سەر دەروونەکان لە هەندێك خووڕەوشتدا کە گونجاوە لەگەڵ خووڕەوشتی ئەو کەسەدا کە چاوی تێیدەڕوانیت[٧٣] .

٥ ـ بەڕاستی هاوەجلیس و برادەری خراپ دەتگەیەنێت بە کەسانێکی خراپەکار کەوا پەیوەندی کردنت پێیانەوە زیانت پێ دەگەیەنێت ، وە هەندێك جار ئەو کەسانە لە ڕێدەرچوو تر و گەندەڵکار ترن لە خوودی ئەم برادەرە خراپە خۆشی .

٦ ـ بەڕاستی هاوەجلیس و برادەری خراپ کەم وکوڕیەکانت لێ دەشارێتەوە و دایدەپۆشێت ، وە هەڵە و خراپەکانت بۆ دەڕازێنێتەوە ، وە کاریگەری تاوان کردن سووك دەکاتەوە لە دڵتدا ، وە کەمتەرخەمی کردنت لە چاکەکاری و گوێڕایەڵیت بۆ خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لە لا ئاسان دەکاتەوە .

٧ ـ بەڕاستی تۆ بە هۆی هاوەجلیس و برادەری خراپەوە بێبەش و مەحروم دەبێت لە دانیشتن و تێکەڵ بوون لەگەڵ

---

[٧٣] الذريعة ــ الموضع السابق .

چاکەکاراندا ، چونکە تۆ لەگەڵ ئەودا ڕۆچوویت لە نـاو ئارەزووەکانـدا ، یـان بـە هـۆی ئاگـادار کردنـەوە و قەدەغەلێکردنـتەوە لـە مـەجلیس گـێڕان و دانیـشتن لەگـەڵ چـاکەکاراندا ، یـان بـە هـۆی دانیـشتن و تێکـەڵاوبوونت لەگـەڵ ئـەم لـە ڕێدەرچـووەدا شـەرم دەتگرێـت و بـە کارێکی قورسی دەزانیت کەوا لەگەڵ چاکەکاراندا دانیشیت و تێکـەڵ ببیـت ، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی لـە دەسـت چـوونی خێـر و چـاکە بـە ئەندازەی دوور بوونت لە چاکەکارانەوە .

٨ ـ بەڕاستی ئـەو کەسـەی کـە دادەنیـشێت لەگـەڵ خراپـەکاراندا کردەوە خراپەکانی خۆی بەراورد دەکات لەگەڵ کردەوە خراپـەکانی ئەواندا ، ئەنجا خراپەکانی خۆی بە کەم دەزانێت لە ئاست خراپەکانی ئەواندا ، ئەمەش دەبێتە هـۆی زیـاد بـوونی سەرکەشـی و زیـادەڕەوی کردن و ڕۆچوون لە خراپە و لە ڕێدەرچوون و کەمتەرخەمی کـردن لـە چاکەکردندا ، وە بە لایەنی کەمەوە سەرسام دەبێت بەوەی کە ئەو لە سەریەتی ، وە سەرسام بوونیش نەخۆشیەکی کووشندە و لەناویـەرە وەك لە پێشەوە باس کرا [٧٤].

٩ ـ بەڕاستی کۆڕ و مەجلیسی خراپەکاران بەدەر نییە لە چەندین گوفتـار و کـردەوی حـەرام و تـاوان وەك غەیبـەت و فیتنـەیی و درۆ و

---

[٧٤] بڕوانە لاپەڕە : (٣٤) .

لەعنەت لێکردن و هاوشێوەی ئەمانە ، جا لەوانەیە ئەو کەسەی کە لەگەڵیاندا دادەنیشێت خۆی بگۆدجێنێت و بسازێت لەگەڵیاندا لەوەی کە ئەوان تێیدان ، یان ڕێگری ئەو کارە خراپەیان لێدەکات بەڵام لە هەمان کاتدا جیانابێتەوە لە مەجلیسەکەیان و لێیان دوور ناکەوێتەوە بۆیە دەکەوێتە ناو تاوانەوە ، چونکە ڕێگرتن لە تاوان و ئینکاری کردنی ـ وەك زانایان دەڵێن ـ ئەوە پێویست دەکات کە جیا ببێتەوە لەو مەجلیسە ئەگەر بەردەوام بوون لە سەر ئەنجامدانی ئەو تاوانە ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾﴾ [سورة الأنعام] .

واتە : ئەگەر کەسانێکت بینی ڕۆچوون لە ئایەتەکانماندا بەوەی کە پێچەوانەی حەق بێت ئەوا پشتیان لێبکە و لێیان دووربکەوەرەوە تاوەکو دەچنە ناو باسێکی ترەوە جگە لەوە ، وە ئەگەر شەیتان لە بیرتی بردەوە و ئامادەی ئەو جۆرە مەجلیسانە بوویت ئەوا لە دوای بیرخستنەوە و ئاگادارکردنەوەیان لەگەڵ کەسانی ستەمکار و تاوانباردا دامەنیشە .

وە خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ ﴿١٤٠﴾ ﴾ [سورة النساء] .

واتە : بەدڵنیاییی لە قورئاندا دابەزیوەتە سەرتان کەوا ئەگەر بیستان کوفر دەکرێت بە ئایەتەکانی خوا یان گاڵتەیان پێدەکرێت ئەوا لەگەڵیاندا دامەنیشن تاوەکو دەچنە ناو باسێکی ترەوە جگە لەوە ئەگینا ئێوەش وەکو ئەوانن .

١٠ ـ بەڕاستی برادەرێتی و هاوڕێیەتی کردن لەگەڵ خراپەکاردا لە ڕێی ئەماندایە لەگەڵ پەیدا بوونی کەمترین ناکۆکی یان گۆڕانی بەرژەوەندی ، بەڵکو بە کەمتر لەوەش ڕقەبەرایەتی پەیدا دەبێت .

(عبد الله بن المعتز) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

(إخوان السوء ينصرفون عند النكبة ويقبلون عند النعمة)[٧٥].

واتە : برادەرە خراپەکان لە کاتی تێشکاندا پشتت لێهەڵدەکەن و لە کاتی خۆشیشدا ڕووت لێدەکەن .

* وە (علي بن داود الرقي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

كُلُّ مَنْ كان لا يؤاخيكَ في الله

فلا ترجُ أنْ يدوم إخاؤهُ

---

(٧٥) كتاب العزلة ص : (١٩٤) .

إنّ خيرَ الإخوانِ مَنْ كان في الله

لـــهُ دام ودّه وصفـــاؤهُ[٧٦]

واتە : هەموو ئەوانەی کە برادەریت دەکەن بۆ ئەوەی لە بەر خوا بێت، ئەوا ئومێدی ئەوەی لێنەکەیت کە برادەریەکەی بەردەوام بێت .

بەڕاستی باشترین برادەر ئەوەیە کە برادەریەکەی لە بەر خوا بێت ، ئەوە دۆستایەتی و نیازپاکی لە گەڵتدا بەردەوام دەبێت .

* وە (أبوالـــحسن التهامي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

شيئانِ ينقشعانِ لأولِ وهلةٍ

ظِلُّ الشبابِ وخُلّةُ الأشرارِ[٧٧]

واتە : دوو شت هەن لە ناکاودا هەڵدەمالێن و نامێنن : سێبەری لاوێتی و برادەرێتی خراپەکاران .

* وە نەقشی مۆری هەندێك لە دانایان بریتی بووە لـە (مَـــنْ ودَّكَ لأمرٍ ولّـــى مع انقضائه)[٧٨].

واتە : هەر کەسێك دۆستایەتیت لە گەڵدا بکات لە بەر شتێك ئەوا پشتت لێ دەکات لەگەڵ کۆتایی پێهاتنی ئەو شتەدا .

---

[٧٦] كتاب الـــمتحابين في الله ص : (٣٧) رقم : (٢٨) .

[٧٧] ديوان أبي الـــحسن التهامي ص : (٣١٥) .

[٧٨] كتاب العـــزلة ص : (١٥١) .

* وە (ابن حبَّان) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (العاقل لا يُصاحبُ الأشرارَ ، لأنَّ صُحبةَ صاحب السوء قِطْعَةٌ من النـــار ، تعقـــب الضغائن ، لا يستقيم وِدُّهُ ولا يَفي بعهده)[٢٩].

واتــە : مرۆڤــی ژیــر هاوڕێیــەتی خراپــەکاران ناکــات ، چــونکە هاوڕێیەتی کردنی برادەری خراپ پارچەیەکە لە ئاگر ، ڕق و کینەی بە دوادا دێت و دۆستایەتیشی ڕاست و تا سەر نابێت و وەفاداریش نابێت بە بەڵێن و پەیمانەکانی .

* وە (ابن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویـەتی : (ئەگـەر خەڵکی هاوکاری یەکتر بکەن لە سەر تاوان و دەست درێـژی و سنوور شکاندن ئەوا هەندێکیان ڕقیان دەبێت لە هەندێکی تریان ، ئەگەر چی بە ڕەزامەندی خۆشیان ئەو کارانە ئەنجام بدەن ، طاوس فەرموویەتی : هەر دوو پیاوێك کۆببنەوە لە بەر غەیری خوا ئیللا جیا دەبنـەوە بـە دڵ ڕەنجانەوە لە یەکتر .

کەواتە برادەرێتی ئەگەر لە سەر بەرژەوەندی هەردوولا نەبوو ئەوا سەرئەنجامەکەی دژایەتی‌یە ، وە تـەنها کاتێك لـە سـەر بەرژەوەنـدی هەردوولا دەبێت ئەگەر ئەو برادەرێتی‌یە لە بەر خـوا بێـت ، وە ئەگـەر وا نەبوو ئەوا هەر یـەکێکیان ئەگـەر چـی هاوکـاری یـەکتری بکـەن لـە

---

[٢٩] روضة العقلاء ص : (١٠١) .

کاتێکدا کە داوای یارمەتی لە یەك دەکەن بە ڕەزامەندی خۆیان ئەوا ئەم ڕەزامەندیە هیچ بایەخێکی نیە بەڵکو سەرئەنجام دەگەڕێتەوە سەر ڕقەبەرایەتی و دژایەتی و لەعنەت لە یەکتر کردن ، وە هەر یەکێکیان بەوی تریان دەڵێت : ئەگەر تۆ نەبوبیەیت ئەوا من ئەمەم نەدەکرد ..)[٨٠].

١١ ـ بەڕاستی برادەرێتی خراپەکاران ئەگەر چی لە دونیاشدا دۆستایەتیان بەردەوام بێت ئەوا لە ڕۆژی دوایدا زۆر بە پەلە لادەچێت و هەڵدەگەڕێتەوە بۆ دژایەتی و ڕقەبەرایەتی ، وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ [سورة الزخرف] .

واتە : برادەران لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێکیان دوژمنی هەندێکیانن تەنها کەسانی لە خوا ترس و خۆپارێزەر لە تاوان نەبێت .

وە هۆی گۆڕینەوەی ئەم خۆشەویستی و برادەرێتی‌یە بە دژایەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرهەم و میراتەی کە لەم برادەرێتی‌یەوە بۆیان ماوەتەوە لە هاوکاری کردنی یەکتر لە سەر تاوان و سەرپێچی و دەست درێژی .

---

[٨٠] مجموع الفتاوى : (١٥ / ١٨٢ ــ ١٨٣) .

وە خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا ﴿٢٥﴾﴾ [سورة العنكبوت] .

واتە : پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) بە قەومەکەی خۆی فەرموو : بەڕاستی ئێوە جگە لە خوا هەندێك بتتان هەڵبژاردووە بە مەبەستی دۆستایەتی نێوان هەر دوو لاتان لە ژیانی دونیادا ئەنجا لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێکتان باوەڕی بە هەندێکی ترتان نامێنێت و لەعنەت و نەفرەت لە یەکتری دەکەن .

(ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (ئەوانە بە کافر زانین و باوەڕ پێنەبوون و لەعنەت و نەفرەت لە یەکتر کردنی هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان تەنها لە بەر ئەوە نییە کە سەرپێچی خوای کردووە ! بەڵکو لە بەر ئەوەیە کە بە هۆی بەشداری و هاوکاری ئەوەوە زیان و زەرەری لێکەوتوە)[٨١] .

١٢ ـ زۆربەی کۆڕ و مەجلیسەکانی خراپەکاران و لەڕێدەرچووان باسی خوای تێدا ناکرێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی خۆخواردنەوە و پەشیمانی بۆ خاوەنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا ، هەر وەك چۆن

[٨١] مجموع الفتاوى : (١٥ / ١٢٩) .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ فِيهِ إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ وَكَانَ لَهُمْ حَسْرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[٨٢].

واتە : هیچ كۆمەڵە كەسێك نییە لە مەجلیسێكدا هەستن و باسی خوایان تێدا نەكردبێت ئیللا وەكو ئەوە وایە كە لە سەر لاكی گوێدرێژێك (كەرێك) هەستابێتن ، وە ئەو دانیشتنەشیان دەبێتە هۆی خۆخواردنەوە و پەشیمانی بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا .

١٢ ـ بەڕاستی دانیشتن و هاوڕێیەتی كردن لەگەڵ خراپەكاراندا كات بە فیڕۆ دانی تێدایە كە لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوە و موحاسەبەی بەندەی لە سەر دەكرێت كە كەمتەرخەمی تێدا كردووە و لە دەستی داوە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ : عَنْ عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ مَا عَمِلَ بِهِ ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ ؟))*.

واتە : هەردوو پێی هیچ عەبدێك نییە لە ڕۆژی قیامەتدا هەنگاو

---

[٨٢] رواه أبو داود في سننه : (٥ / ١٨٠ ـ ح ٤٨٥٥) وصحح إسنادَهُ النووي في رياض الصالحين رقم : (٨٣٨) والألباني في صحيح الجامع رقم : (٥٧٥٠) .

* صحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣٥٩٢) ـ وەرگێڕ ـ .

بنێت ئاوەكو پرسیاری چوار شتی لێنەكرێت : سەبارەت بە تەمەنی لە چیدا بە سەری بەردووە ؟ وە سەبارەت بە زانستەكەی ئایا كردەوەی پێ كردووە ؟ وە سەبارەت بە پارە و ماڵەكەی چۆن پەیدای كردووە و لە چیدا خەرجی كردووە ؟ وە سەبارەت بە لاشەی لە چیدا بە كاری هێناوە و دایهێناوە ؟

١٤ ـ بەڕاستی تۆ بەودا دەناسرێیتەوە ، وە گومانی خراپت پێ دەبرێت بە هۆی هاوڕێیەتی كردنتەوە لەگەڵ ئەودا .

بە گشتی تێكەڵاوی كردنی خراپەكاران زیان و زەرەرە بۆ خاوەنەكەی لە دونیا و دوا ڕۆژدا .

* (الشیخ عبد الرحمن السعدي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (بە گشتی هاوڕێیەتی كردنی خراپەكاران زیانبەخشە لە هەموو ڕوویەكەوە بۆ هەر كەسێك كە هاوڕێیەتیان بكات ، وە بەڵا و خراپەیە بۆ ئەوانەی كە تێكەڵاوییان دەكەن ، چەندین خەڵك بە هۆی ئەو خراپەكارانەوە فەوتا و لە ناو چوو ، وە چەندێك هاوڕێكانیان ڕاكێشا بۆ كار و شوێنی فەوتێنەر و ڕووخێنەر هەست بكەن بە خۆیان یان هەست نەكەن)[٨٣].

---

[٨٣] بهجة قلوب الأبرار ، الحدیث الثامن والستون .

لە بەر ئەوە (أبو الأسود الدؤلي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (ما خلقَ اللهُ خلقاً أضرَّ من الصاحب السوء)[٨٤].

واتە : خوای گەورە هیچ دروستكراوێكی دروست نەكردووە زیانبەخش تر بێت لە برادەری خراپ .

كەواتە پێویستە لە سەر كەسی ژیر و دڵسۆز و غەم خۆری خۆی كە ڕزگاری و بەختەوەری بۆ خۆی دەوێت لە دونیا و دوا ڕۆژدا كەوا دوور بكەوێتەوە لە تێكەڵاوی كردنی ئەو برادەرە خراپەكارانە و بەو پەڕی تواناوە ڕا بكات لێیان و هیچ كەمتەرخەمیش نەكات لەمەدا .

لە كۆتایی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا و دوای ئەوەی شوێنەوار و بەرهەمەكانی هاوەجلیس و برادەری چاكەكار و زیانەكانی هاوەجلیس و برادەری خراپەكارمان بۆ دەركەوت ، هەندێك وتەی لە پێشینەوە - بەجێماو بۆمان - دەگێڕمەوە بۆتان سەبارەت بە هەڵبژاردنی هاوەجلیس و هاوڕێ و هاندان لەم بوارەدا :

---

[٨٤] الشهاب الثاقب في ذم الخليل والصاحب للسيوطي ص : (٣٢) .

## هەندێك وتەی پێشین سەبارەت بە هەڵبژاردنی هاوەجلیس

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِناً ، وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ))[٨٥].

واتە : هاوڕێیەتی کەس نەکەیت ئیللا ئیماندار نەبێت ، وە با کەس خواردنت نەخوات ئیللا لە خوا ترس نەبێت .

* (الـخطابـي) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا لە کتێبی (العزلـة)دا فەرموویەتی : (واتای فەرموودەکە ئەوەیە : کەسێك دەعوەت مەکە بۆ خواردن لە گەڵتدا ئیللا کەسێکی لە خوا ترس نەبێت ، چونکە پێکەوە خواردن ئاشنایی و کرانەوە لە ڕووی یەکتردا پەیدا دەکات و دڵەکان کۆدەکاتەوە ، جا بە دوای ئەوەدا بگەڕێ کە هاوەڕێ و تێکەڵبووان و برادەرە تایبەتەکانت لە کەسانی لە خوا ترس و خۆپارێز بن لە تاوان و خراپە)[٨٦] .

---

[٨٥] مسند أحمد : (٣ / ٣٨) ، وصحيح سنن الترمذي رقم : (٢٣٩٥) وصحيح سنن أبـي داود رقم : (٤٨٣٢) وحسنه الترمذي والبغوي في شرح السنة : (١٣ / ١٦٩) وابن مفلح في الآداب الشرعية : (٣ / ٥٦١) والألبانـي .

[٨٦] كتاب العـزلة ص : (١٤٢) .

* وە (لقمان الـــحكيم) ڕەحمەتی خوای لێبێت ئامۆژگاری كوڕەكەی دەكات و پێی دەڵێت : (يا بُنَيَّ لا تعدُ بعد تقوى الله مـــنَ أنْ تتخذ صاحِباً صالِحَاً)[٨٧].

واتە : ئەی كوڕی شیرینم لە پاش لە خوا ترسان هاوڕێیەكی چاك هەڵبژێرە و بەس .

* وە (عمر بن الـــخطاب ﷺ) فەرموویەتی : (لا تتكلمْ فيمـــا لا يَعنـــيكَ ، واعتـــزِلْ عدوَّكَ ، واحذَرْ صديقكَ إلاَّ الأمين ، ولا أمـــينَ إلاَّ مَنْ يَخشَى اللهَ ويطـــيعهُ ، ولا تَمْـــشِ مع الفاجر فيُعلِّـــمُك من فجوره ، ولا تطلعـــهُ على ســـرِّكَ ، ولا تُـــشاورْ في أمرك إلاَّ الـــذين يَخـــشون الله)[٨٨] .

واتە : قسە مەكە سەبارەت بە شتێك كە پەیوەندی بە تۆوە نییە ، وە دوورەپەرێز بە لە دوژمنەكەت ، وە وریا بە لە برادەرەكەت ئیللا برادەری ئەمینی دڵ و دەست و زمان و داوێن پاك نەبێت ، وە كەسیش ئەمین نییە ئیللا كەسێك نەبێت كە لە خوا دەترسێت و گوێڕایەڵی دەكات ، وە لەگەڵ خراپەكاردا ڕێ مەكە چونكە فێری خراپەكاریەكانی خۆیت دەكات ، وە نهێنیەكانی خۆتی بۆ ئاشكرا

---

[٨٧] كتاب الإخوان ص : (١١٠) رقم : (٢٥) .

[٨٨] كتاب العـــزلة ص : (١٤٤) .

مەکە و دەریمەبڕە بۆی ، وە لە ئیش و کارەکانتدا پرس وڕا بە کەس مەکە ئیللا بەوانە نەبێت کەوا لە خوا دەترسن .

* هەروەها فەرموویەتی : (ما أُعطيَ عبدٌ بعد الإسلام خيراً من أخٍ صالــح)[٨٩].

واتە : خوای گەورە هیچ شتێکی نەبەخشیوە بە عەبدێك لە عەبدەکانی لە دوای ئیسلام چاکتر بێت لە برادەرێکی چاك و صالح .

* وە (علي بن أبــي طالب رضي الله عنه) فەرموویەتی : (عليكم بالإخوان فإنَّهم عُدَّةٌ في الدنيا والآخرة ، ألاَ تسمع إلى قول أهل النار : ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾ [سورة الشعراء])[٩٠].

واتە : پەیوەست بن بە برادەرانی چاکەکارەوە چونکە بەڕاستی ئەوانە پشتگیریت لێدەکەن لە دونیا و دواڕۆژدا ، ئایا گوێناگریت بۆ قسەی دۆزەخیەکان کە دەڵێن : لێرەدا کەس نیە تکا و ڕجامان بۆ بکات ، وە برادەرێکی دۆست و دڵسۆزیشمان نیە پشتگیریمان لێبکات .

* وە (الغزالــي) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە کتێبی (الإحياء)دا وتویەتی : (عيسى ابن مريم عليه السلام) فەرموویەتی : (جالــسوا مَــنْ

---

[٨٩] اتحاف السادة المــتقين : (٦ / ١٣١) .

[٩٠] إحياء علوم الدين : (٢ / ١٦٠) .

تذكركم اللهَ رؤيتُه ، ومَنْ يزيدُ في عملكم كلامُــهُ ، ومَــنْ يــرغبكم في الآخرة عملهُ)[٩١].

واته : لەگەڵ كەسانێكدا دابنیشن كەوا خوالتان بیربكەوێتـەوە بـە بینیان ، وە كردەوەتان زیاد بكات بە قسەیان ، وە هانـدەرت بـن بـۆ دوارۆژ بە كردەوەیان .

* وە (الــحسن البصري) رەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (ما ازداد أحدٌ منكم أخاً في الله إلاّ ازداد درجةً)[٩٢].

واته : هیچ یەكێك لە ئێوە نی‌یە برادەرێكی لە بەر خوا زیاد بكات ئیللا بە هۆیەوە پلەیەك بەرز دەبێتەوە .

* وە (أبو الدرداء ﷺ) فەرموویەتی : (لولا ثلاث لأحببتُ أنْ أكونَ في بطن الأرض لا على ظهرها : لولا إخوانٌ لــي يأتونــي ينتقون طيِّب الكلام كــما ينتقي طيِّب التمر ، أو أعفِّر وجهي ساجداً لله ، أو غدوة لو روحة في سبيل الله عز وجل)[٩٣].

واته : ئەگەر لە بەر سێ شت نەبوایەت ئەوا پێمخۆش بوو لـە ژێـر زەویدا ببوایەم نەك لە سەر زەوی : ئەگـەر برادەرانێكم نەبوایـەت كـە

---

[٩١] الــمصدر السابق : (٢ / ١٥٩) .

[٩٢] الــمطالب العالية : (٤ / ١٠) .

[٩٣] الزهد للإمام أحمد ص : (١٣٥) .

دێن بۆ لام و وتەی خۆشم بۆ هەڵدەبژێرن هەروەكو چۆن خورمای خۆشم بۆ هەڵدەبژێرن ، یان ڕوومەتم خۆڵاوی دەكەم لە كاتی سوجدەدا بۆ خوا ، یان هەنگاوێكی ڕۆیشتن یان گەڕانەوە لە پێناوی خوادا بنێم .

* وە (محمد بن واسع) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (ما بَقِيَ في الدنيا شيءٌ أَلُذُّ به إلاَّ الصلاة جماعة ، ولقي الإخوان)[٩٤].

واته : لە دونیادا هیچ شتێك نەماوە چێژی لێببینم شیللا نوێژ لە جەماعەتدا و گەیشتن بە برادەران نەبێت .

* وە (بلال بن سعد) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (أَخٌ لك كلّما لقيكَ ذكّركَ بحظكَ من الله خيرٌ لك من أخٍ كلما لقيكَ وضع في كفّكَ ديناراً)[٩٥].

واته : برادەرێكت كەوا هەر كاتێك پێت بگات بەشی خۆتت لە لای خوا بیر خاتەوە چاك ترە بۆت لە برادەرێك كەوا هەر كاتێك پێت بگات دینارێك بخاتە ناو دەستەوە .

* وە پرسیار كراوە لە هەندێك لە دانایان : (أيُّ الكنوزِ خير ؟ قال : أمّا بعد تقوى الله ، فالأخ الصالـــح)[٩٦].

---

[٩٤] الزهد للإمام أحمد ص : (٣١٣) .

[٩٥] الزهد لابن المبارك ص : (١٦٧) ، والحلية : (٥ / ٢٢٥) .

واتە : چ گەنجینەیەك (چ شتێكی بە نرخی هەڵگیراو) چاك تـرە ؟

فەرمووی : لە خوا ترسان ئەدجا برادەری چاك .

* وە وتراوە بە (سفیان) ڕەحمەتی خوای لێبێت : (ما ماءُ العیش ؟ قال : لقاءُ الإخوان)[٩٧].

واتە : ئاوی ژیان بریتییە لە چی ؟ ئـەویش فـەرمووی : گەیشتن بە برادەران .

* وە هەندێك لە پێشین (سەلەف) فەرموویەتی : (أعجزُ الناسِ من قصَّر في طلب الإخوان ، وأعجزُ منهُ مَنْ ضَيَّعَ من ظفر به منهم)[٩٨].

واتە : بێ دەسەڵات ترینی خەڵك ئـەو كەسـەیە كـە كەمتەرخەمی بكـات لـە گـەڕان بـە دوای بـرادەردا ، وە لـەو بـێ دەسـەڵات تـر ئـەو كەسەیە كەوا ئەگەر برادەری چاكی دەست كەوت لە دەستی بدات .

* وە وتراوە بـە (محمد بن واسع) ڕەحمـەتی خـوای لێبێت : ئایا چاكترین كردەوە لە دونیادا كامەیە ؟

ئەویش فەرمووی : (صحبة الأصـــحاب ، ومُحادثــة الإخـــوان إذا اصطحبوا على التُّقى والبِرّ فحينئذٍ يذهب الـــخلاف من بينهم)[٩٩].

---

[٩٦] كتاب الإخوان ص : (١٣٣) رقم : (٦١) .

[٩٧] روضة العقلاء ص : (٩٣) .

[٩٨] الإحياء : (٢ / ١٨٠) .

[٩٩] كتاب الإخوان ص : (١٢٨) وكتاب الـــمتحابين في الله ص : (٣٠) .

ولە : هاوڕێیەتی کردنی هاوڕێیانی چاك ، وە قسە کردن لەگەڵ براادەرلندا ئەگەر برادەرێتیەکەیان لە سەر خوا ترسان و چاکەکاری بێت ئەوا ئەو کاتە ناکۆکی نێوانیان نامێنێت .

* وە (مالك بن دينـــار) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (إنَّكَ إنْ تنقل الأحجارَ مع الأبرار خيرٌ لك مِنْ أنْ تأكلَ الـــخبيصَ مـــع الفُجَّار ، وأنشد :

وصاحب خيار الناسِ تنج مسلماً

وصاحب شِرار الناسِ يوماً فتندما)[100].

ولە : بەڕاستی ئەگەر تۆ لەگەڵ چاکەکارلندا بەرد بگوێزیتەوە چاك ترە بۆت لەوەی کەوا خورما و ڕۆن بخۆیت لەگەڵ خراپەکارلندا ، ئەنجا ئەم بەیتەی خوێندەوە :

"هاوڕێیەتی چاکترینی خەڵك بکە بە سەلامەتی ڕزگارت دەبێت .. وە بۆ تەنها ڕۆژێکیش هاوڕێیەتی خراپترینی خەڵك بکە پەشیمان دەبیتەوە" .

* وە (هلال الرأي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (أوثق الـــمودَّات ما كان في الله عز وجل)[101].

---

[100] تفسير القرطبي : (٢٧/١٣) ، وهو في روضة العقلاء ص : (١٠٠) بدون البيت .

[101] تـــهذيب تاريخ دمشق : (١ / ٤٣٩) .

واتە : بەهێزترین دۆستایەتی ئەوەیە کەوا لە پێناوی خوای گەورەدا بێت .

* وە (المأمون) فەرموویەتی : (إنْ غلب شيءٌ على حُبِّ المال والولد فالأخُ الصالح)[١٠٢].

واتە : ئەگەر شتێك هەبێت کە زاڵ ببێت بە سەر خۆشەویستی ماڵ و منداڵدا ئەوا برادەری چاکە .

* وە (سفيان الثوري) ڕەحمەتی خوای لێبێت ئەم دوو بەیتەی دەخوێندەوە :

ابلُ الرجال إذا أردتَ إخاءهم
وتوسَّمنَّ أمورهم وتفقّدِ
فإذا وجدتَ أخا الأمانةِ والتُّقى
فبهِ اليدين قرير عينٍ فاشددِ[١٠٣]

واتە : ئەگەر ویستت برادەرێتی پیاوانێك بکەیت ئەوا تاقیان بکەرەوە ..

حاڵ و کاریان دەست نیشان بکە و بە دوایدا بگەڕێ ..

جا ئەگەر بینیت برادەرێکی دەست و زمان پاکە و لە خوا ترسە ..

---

[١٠٢] جنّة الرضا في التسليم لما قدّر الله وقضى للغرناطي : (٣ / ٦٨) .

[١٠٣] كتاب الإخوان ص : (١١٥) وروضة العقلاء ص : (١٠٥) .

ئەوا بە هەردوو دەستت بە توندی بیگرە خۆت بۆ ئەوەی چاوەكانت تۆقرە بكرێت .

* وە (محمد بن عمران) رەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

وما الـــمرءُ إلاّ بـــإخوانـــه
كما تقبضُ الكفّ بالـــمعصمِ
ولا خيرَ في الكف مقطوعة
ولا خيرَ في الساعدِ الأجـــذمِ[١٠٤]

واتە : مرۆڤ هیچ نییە ئیللا بەبرادەرەكانیەوە نەبێت .. هەر وەكو چۆن بە مەچەك لەپ دەكەیت بە مشت ..

وە هیچ سوودێك لە لەپەی بڕاوەدا نییە .. وە هیچ سوودێك لە بازووی گەڕ و بڕاوەدا نییە .

* وە هەندێك لە شاعیران وتویانە :

تجنّبْ قرينَ السوءِ واصرم حبالـــه
فإنْ لـــم تجدْ عنه مَحيصاً فداره
واحببْ حبيب الصِّدقِ واحذرْ مراءَهُ
تنل منه صفوَ الودِّ ما لـــم تُماره[١٠٥]

---

[١٠٤] روضة العقلاء ص : (٦٨) .

[١٠٥] تفسير القرطبي : (١٣ / ٢٦) .

واتە : خۆت بە دوور بگرە لە برادەری خراپ و پەیوەندی لەگەڵدا بپچڕێنە .. وە ئەگەر ڕێگا چارەت نەبوو ئەوا ژیانی لەگەڵدا بگوزەرێنە ..

وە خۆشەویستی ڕاستت خۆشبوێت و ئاگاداریش ببە لەوەی کە مشت و مڕی لە گەڵدا بکەیت .. چونکە بەو شێوازە دۆستایەتی پاکت لێیەوە دەست دەکەوێت ئەگەر مشت و مڕی لە گەڵدا نەکەیت .

* وە یەکێکی تر وتویەتی :

اصحَبْ خيار الناسِ أين لقيتهم
خيرُ الصحابة مَنْ يكون ظريفاً
والناسُ مثل دراهم ميَّزتَــهــا
فرأيت منــها فضةً وزيوفــاً[١٠٦]

واتە : هاوڕێیەتی چاکترینی خەڵك بکە لە هەر کوێیەکدا پێیان گەیشتیت ..چاکترین هاوڕێ ئەو کەسەیە کەوا ڕێك و پێك و سەرنج ڕاکێش بێت ..

خەڵکی وەکو دیرهەم وان لە کاتێکدا کەوا جیایان دەکەیتەوە .. لە ناویدا زیوی ڕەسەن و ساختەش (مزەوەر) دەبینیت .

---

[١٠٦] روضة العقلاء ص : (١٠٢) وتفسير القرطبي : (١٣ / ٢٦) .

برام لە کۆتاییدا دەڵێم :

خۆت پەیوەست بکە بە هاومەجلیس و برادەری خێر ویست و چاکەکار و ئەمەش لە ناخی خۆتدا جێگیر بکە ، وە سوود ببینە لە زانست و ڕەوشت و کردەوەکانیان ، وە خۆت ڕۆشنبیر بکە بە بۆچوون و ڕێنماییەکانیان ، وە ئەوەش لە بیر ناکەم کەوا دەبێت صەبر و ئارام گرتنیت یاد خەمەوە لە سەر ئەو ئازار دان و کەم و کوڕیانەی کە لە لایەن هەندێکیانەوە دەیبینیت بە هۆی زاڵبوونی ناتەواوی بە سەریانەوە ، هەروەها بە هۆی جیاوازی تەبیعەت و ڕەوشت و ئاکاریانەوە .

وە بەردەوام ئەم ئایەتە بهێنەرە پێش چاوی خۆت و بیهێنە بە سەر لاپەڕەکانی دڵتدا کەوا خوای گەورە تێیدا فەرموویەتی : ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾ [سورة الكهف] .

واتە : ئارام بگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کەوا خوای پەروەردگاریان دەپەرستن و لێی دەپاڕێنەوە بە بەیانیان و ئێواران بە مەبەستی

* مەبەستی ئەوەیە لەگەڵ کەسانی خوا پەرستدا تێکەڵ بیە و هاوڕێیەتی ئەو جۆرە کەسانە بکە و تەنها چاو مبڕە ئەوان و لا مەکەرەوە بە لای ئەوانەدا کە بێئاگان لە خوا و بەرنامە پیرۆزەکەی .

ڕەزامەندی و پاداشتی پەروەردگاریان ، وە چاوەكانت تێمەپەڕێنە لێیان بە مەبەست جوانی ژیانی دونیا ، وە گوێڕایەڵی ئەو كەسانە مەكە كەوا بێئاگامان كردوون لە یاد و بەرنامەكەی خوا و شوێنی ئارەزووی خۆیان كەوتوون و بەرژەوندیەكانی دین و ژینی خۆیان لە دەست داوە و فەوتاندوویانە .

داواكارم لە خوای گەورە كەوا هاوەڵ و برادەری چاكەكار ئەوانەی دەستمان دەگرن بەرەو بەختەوەری دونیا و دوارۆژ بۆ من و ئێوەش بە نسیب كات ، وە كردنی چاكە و خێرەكان و وازهێنان لە خراپەكانمان پێ ببەخشێت ، وە بمانكاتە كلیلی كردنەوەی دەرگای چاكە و داخستنی خراپە ، وە هەر هەمووشمان كۆبكاتەوە لە جێگای ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی .. آمین .

وصلى اللهُ وسلّمَ على نبينا محمد

وعلى آلــهِ وصحبهِ أجمعين

تەواو بووم لە وەرگێڕانی ئەم نامیلكەیە

لە پێش نوێژی مەغریبی ڕۆژی شەممە ڕێكەوتی :

٢٧ / ٤ / ١٤٢٩ ك

٣ / ٥ / ٢٠٠٨ ز

(باوكی فیردەوس محمد عبد الرحمن لطيف) / كەلار

(٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣)

پاشکۆ :

# باشترین
# هاوڕێی بێدەنگ کتێبە

# و

# هەڵگرانی
## زانستی شەرعی و پەیڕەوکارانی سوننەت
# باشترین
# هاوڕێ و هاومەجلیسن

بە پێنووسی
محمد عبد الرحمن لطیف

## باشترین هاوڕێی بێدەنگ کتێبە

هەندێك لە دانایان وتویانە : (الكتابُ خيرُ جلـيس) واتـە : کتێـب باشترین هاوەجلیس و هاوڕێیە .

وە شاعیرێك وتویەتی :

وخيرُ جليسِ الـمرءِ كُتُبٌ تُفيدُهُ

عُلوماً وآداباً كعقلٍ مونْد(*)

واتە : باشترین هاوەجلیسی مرۆڤ کتێبانێکە کە وەکو عەقڵێکی هێمن و لەسەرخۆ چەندین زانست و ئادابی پێدەگەیەنن .

بەڕاستی کتێب ئەو هاوڕێ بێدەنگەیە کەوا دانایەتی و زانستی بە سوودی لێوە بە دەست دەخـەیت ، وە هـەرگیز نهێنییـەکانی ژیانـت ئاشکرا ناکات و خیانەت و ناپاکیت لەگەڵدا ناکات .

هەروەها وترلوە کتێـب : (حاضرٌ نفعهُ ، مـأمونٌ ضُـرُّهُ ، ينـشطُ بنشاطكَ فينبسطُ إليك ، ويَملُّ بملالكَ فينقبضُ عنك ، إنْ أدنيتَهُ دنـا ، وإنْ أنأيتَهُ نأى ، لا يبغيك شرّاً ، ولا يفشي عليك سِرّاً ، ولا يَنِمُّ عليك ، ولا يسعى بنميمة إليك)(**).

واتـە : کتێـب سـوودەکانی دەسـتبەجێ و ئامادەیـە ، بێـوەی و بێزیانە ، گۆڕج دەبێتـەوە بـە گۆڕج بوونـەوەی تـۆ بۆیـە خۆیـت بـۆ

(*) بڕوانە کتێبی : الثمار اليانعة من الكلمات النافعة لاپەڕە : (٣٦٥ ــ ٣٦٦) .

(**) تقييد العلم للخطيب البغدادي لاپەڕە : (١٥٧) .

دەکاتــەوە ، وە بێــزار دەبێــت بــە بێــزار بــوونی تــۆ بۆیــە خۆیــت لــێ دەگرێتەوە و دادەخرێـت ، ئەگـەر نزیکـی بکەیتـەوە لێـت نزیـك دەبێتەوە ، وە ئەگەر دووری خەیتەوە ئەویش لێت دوور دەکەوێتـەوە ، خرپەی بۆت ناوێت ، نهێنییەکانت ئاشکرا ناکات ، هەواڵ و قسەت ناگەیەنێت بە کەسانی تر ، وە هی ئەولنیشت بۆ ناهێنێت بە مەبەستی تێکدان و ئاشووب گێڕان .

وە (الــخطيب البغدادي) فەرموویـەتی : (ومع ما في الكتب مــن الــمنافع العميمة ، والــمفاخر العظيمة ، فهي : أكرمُ مــالٍ ، وأنفــسُ جمالٍ ، والكتابُ آمنُ جليسٍ ، وأسَرُّ أنيسٍ ، وأســلمُ نــديمٍ ، وأفــصحُ كليمٍ)[*] .

واتــە : کتێـب لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە چـەندین سـوودی گـشتی و شانازی گەورەی تێدایە بریتییە لە : بەرێزترین ماڵ و سامان ، بەنرخ ترین جوانی ، وە کتێب بێزیان ترین هاوەجلیسە ، نهێنی پـارێزترین (یان دڵخۆشـکارترین) هاورێیـە ، بێـوەی تـرین هاودەمـە ، پـاراوترین قەسەکەرە .

وە ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی کەوا : کتێب بکەیت بە هاوەجلیس و هاورێت لە کاتی تەنهاییتدا :

---

[*] تقييد العلم للخطيب البغدادي لاپەڕە : (١٥٨) .

(قيل لرجلٍ : مَنْ يُؤنسك ؟ فضرب على كتبه وقال : هذه ، فقيل : منَ الناس ؟ فقال : الذين فيها)(*).

واتە : وترا وە بە پیاوێك : كێ دڵخۆش و دڵنەواییت دەكات ؟

ئەویش دای بەسەر كتێبەكانیدا و وتی : ئەمانە .

وترا : لە خەڵكی ؟

وتی : ئەوانەی كە تێیدان .

(وقيل لبعضهم : أما تستوحش ؟ فقال : يستوحش مَنْ مع الأنس كله ؟ قيل : وما الأنس كله ؟ قال : الكتب)(*).

واتە : وترا وە بە هەندێك : هەست بە تەنهایی و دابڕان و سامناكی ناكەیت ؟ ئەویش وتی : ئایا كەسێك هەیە هەست بە تەنهایی و دابڕان و سامناكی بكات كەوا لەگەڵ هەموو هاوڕێكاندا .

وترا : ئەو هەموو هاوڕێیانە كێن ؟

وتی : كتێبن .

(وقال بعض الوزراء : يا غلام ائتني بأنس الخلوة ومَجمع السلوة ، فظنَّ جُلساؤه أنّه يستدعي شَراباً ، فأتاهُ بسفط فيه كُتُبٌ)(*).

واتە : هەندێك لە وەزیرەكان وتویەتی : ئەی خزمەتكار هاوڕێی تەنهایی و كۆكەرەوەی دڵنەوایی و خەم ڕەوێنەرەوەم بۆ بێنە .

(*) تقييد العلم للخطيب البغدادي لاپەڕە : (١٦٣) .

هاوەجلیسەکانی وا گومانیان برد کەوا داوای خوارنەوەیەك دەکات .

ئەویش : سەبەتەیەکی بۆ هێنا کتێبی تێدا بوو .

وە (شقیق بن إبراهیم البلخي) فەرموویەتی : (قلنا لابن السمبارك : إذا صلیتَ معنا لِمَ لا تجلسُ معنا ؟ قال : أذهبُ فأجلسُ مع التابعین والصحابة ، قلنا : فأین التابعون والصحابة ؟ قال : أذهبُ أنظرُ في علمي فأدرك آثارهم وأعمالهم ، ما أصنع معکم ؟! أنتم تجلسون تغتابون الناس ، فإذا کان سنة مائتین فالبعدُ من کثیر من الناس أقربُ إلى الله تعالى ، فرَّ من الناسِ کفرارك من الأسد ، وتَمسَّكْ بدینك ، یسلَمُ لك لَحمُكَ ودَمك)(*).

واتە : وتمان بە (عبد الله بن السمُبارك [ ١١٨ ــ ١٨١ك]) : بۆ چی کاتێك نوێژت تەواو کرد لەگەڵ ئێمەدا دانانیشیت لە گەڵماندا ؟

ئەویش فەرمووی : دەڕۆم لەگەڵ شوێنکەوتوان و هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ دادەنیشم ، وتمان : ئەی شوێنکەوتوان و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە کوێن ؟

فەرمووی : دەڕۆم سەیری زانستەکەم دەکەم و دەگەم بە شوێنەوار و کردەوەکانیان ، چی بکەم لەگەڵ ئێوەدا ؟!

---

(*) تقیید العلم للخطیب البغدادي لاپەڕە : (١٦٤) .

ئێوە دادەنیشن غەیبەتی خەڵکی دەکەن ، جا خۆ ئەگەر بکاتە ساڵی (٢٠٠) دووسەد ئەوا دوور کەوتنەوە لە زۆربینەی خەڵکی نزیک ترت دەکاتەوە لە خوای گەورە ، ڕا بکە لە دەست خەڵکی وەکو چۆن ڕا دەکەیت لە دەست شێر ، وە پەیوەست ببە بە دینەکەتەوە و دەستی پێوە بگرە ئەوا گۆشت و خوێنەکەت بێوەی دەبێت .

وە (مُحرز بن حبر المروزي) فەرموویەتی : (قيل لابن المبارك : يا أبا عبد الرحمن لو خرجتَ فجلستَ مع أصحابك ، قال : إنِّي إذا كنتُ في المنزلِ جالستُ أصحاب مُحَمَّد ﷺ ـ يعني النظر في الكتب ـ)(*) .

واتە : وترا بە (عبد الله بن المُبارك) : ئەی باوکی عبد الرحمن بۆ دەرناچیت لەگەڵ هاوڕێکانتدا دابنیشیت ، ئەویش فەرمووی : من ئەگەر لە ماڵدا بم ئەوا لەگەڵ هاوەڵانی (مُحَمَّد)دا ﷺ دادەنیشم ، واتە : سەیری کتێب دەکەم .

وە (عبد الحميد التوزي) فەرموویەتی : (الكتابُ نِـدِيمٌ ، عهدُهُ وفائه قديم ، الكتابُ مُنادم ، ليس مَنْ نادَمَه بنادم ، الكتابُ حميمٌ ، خبرهُ عَميم ، الكتابُ أخٌ غيرُ خوَّان ، فتفرَّدْ عن الإخوان ، الكتابُ سميرٌ ، سليمُ الظاهر والضمير)(**) .

---

(*) تقييد العلم للخطيب البغدادي لاپەڕە : (١٦٣) .

(**) تقييد العلم للخطيب البغدادي لاپەڕە : (١٦٢) ، وە بڕوانە کتێبی : إيقاظ الهمة لطلبة علم الكتاب والسنة لاپەڕە : (٣٩ ـ ٤٠) .

واتە : كتێب هاودەم و هاوڕێیە ، بەڵێنی وەفادارى دێرینە ، كتێب ڕاتێیت لەسەرى ، ئەو كەسەش كە ڕاهات لەسەرى هەرگیز پەشیمان نابێتەوە ، كتێب هاوەڵى دڵسۆز و گیانى بە گیانیە ، خێرەكانى گشتیە ، كتێب برایە و خیانەت كار نىیە ، بۆیە تەنها بەرەوە لەگەڵیدا بێ لە برادەران ، كتێب هاوڕێ و هاوڕازى شەوگارە ، ڕواڵەت و ناوەڕۆكى بێوەیە .

مەبەستیش بە وشەى (كتێب) لێرەدا ئەو كتێبەیە كە زانستى بە سوود و ڕاست و ڕەسەنى لە خۆ گرتبێت ، زانستێك كە سوودى دین و ژینى تێدا بەرقەرار بێت ، ئاشكراشە كە (**زانستى شەرعى**) سەروەرى هەموو زانستە بە سودەكانە و بەختەوەرى ژین و دینى پێوە بەندە .

**پێناسەى زانست :**

١ ـ ئیمامى (محمد بن عبد الوهاب) فەرموویەتى : (**العلم** هـو : معرفة الله ومعرفة نبيه محمد ﷺ ومعرفة دين الإسلام بالأدلة) .

واتە : **زانست** بریتىیە لە : ناسینى خوا و ناسینى پێغەمبەرەكەى (محمد ﷺ) و شارەزا بوونە لە ئاینى ئیسلام بە بەڵگەوە .

٢ ـ وە پێشەوا (ابن القيم) فەرموویەتى : (**العلمُ** قـال الله قـال رسولُهُ قال الصحابةُ ...) .

واتە : **زانست** بریتىیە لە : فەرموودەى خوا و فەرموودەى پێغەمبەر و فەرموودەى صەحابە ...

٣ ـ وە ئیمامی (الأوزاعي) فەرموویەتی : (العلمُ ما جاءَ عن أصحاب مُحمَّد ﷺ ، وما لَمْ يَجيءْ عن أصحاب مُحمَّد ﷺ فليسَ بعلمٍ).

واتە : زانست ئەوەیە کە لە صەحابەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتبێت ، وە ئەوەی کە لە صەحابەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهاتبێت ئەوا علم و زانست نییە .

٤ ـ وە ئیمامی (شافعي) فەرموویەتی :

(كُلُّ العلومِ سِوى القُرآنِ مَشغلةٌ
إلاَّ الحديثَ وإلاَّ الفقهَ في الدينِ
العلمُ ما كانَ فيه قال حدَّثنا
وما سِوى ذاكَ وَسواسُ الشياطينِ).

واتە : هەموو زانستەکان جگە لە قورئان خۆخەریک کردنە تەنها فەرموودە و تێگەیشتن و شارەزا بوون لە دین نەبێت .

زانست ئەوەیە کە تێیدا بوترێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی و جگە لەمەش هەمووی وەسوەسەی شەیتانە

٥ ـ وە ئیمامی (ابن حجر العسقلاني) فەرموویەتی : (الْمُرَادُ بِالعِلْمِ : الْعِلْمُ الشَّرْعِيُّ الَّذي يُفيدُ مَعْرِفَةَ مَا يَجبُ عَلَى الْمُكَلَّفِ مِنْ أَمْرِ عِبَادَاتِه وَمُعَامَلَاتِه ، وَالْعِلْمُ بِاللَّه وَصِفَاته ، وَمَا يَجِبُ لَهُ مِنَ الْقِيَامِ بِأَمْرِه ، وَتَنْزِيهِهُ عَنِ النَّقَائص ، وَمَدَارُ ذَلِكَ عَلَى التَّفْسِيرِ وَالْحَدِيثِ وَالْفِقْه) "فتح الباري شرح صَحيح البخاري" : (١ / ١٨٧) .

ولـە : مەبەسـت بـە زانـست : زانـستی شـەرعی‌یە کـە سـودی شارەزابوونی تێدایە لەوەی کە پێویستە لە سەر هـەموو موسـڵمانێکی ئەرك لە سەر (تەکلیف لێکراو) لە بواری ئاینەکەیدا لە پەرستنەکانی و لـە هـەڵس و کەوتەکانیـدا ، وە زانیـاری دەربـارەی خـوای گـەورە و سیفەتەکانی و ئەوەی کە پێویستە لە سەری لـە پێنـاوی ئـەودا پـێی هەڵبسێت لە فەرمانەکانی و پاك ڕاگرتنی لە کەم و کوڕی ، وە هـەموو ئەوانەش ڕاوەستاون لە سەر : تەفسیر و فقهـ و فەرموودە .

## هەڵگرانی
## زانستی شەرعی و پەیڕەوکارانی سوننەت
## باشترین هاوڕێ و هاوەڵەجلیسن

باشترین هاوڕێ و هاوەڵەجلیس و برادەر بۆ مرۆڤـ ئـەو کەسـانەن کەوا دوو شتیان تێدا بـە دی دەکرێـت (زانـستی بـە سـوود و کـردەوەی چاك / العلمُ النافع والعمـــلُ الـــصالـــح) ، ئەمـەش تـەنها و تـەنها لـە (هەڵگرانی زانستی شەرعی و پەیڕەوکارانی سـوننەت)دا ئەولـەی کـە حەق و ڕاستییەکان دەزانن و کردەوەشی پێدەکەن (یعلمون الـــحق ویعملون به) دەبینیتەوە .

خـوای گـەورە بـۆی دیـاری و دەسـت نیـشان کـردووین باشـترین هاوڕێ کێن و بە چیش لەگەڵ ئەولندا دەبین ، ئەویش لـەم ئایەتەدایـە

كە تێیدا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ [سورة النساء] .

واتە : هەر كەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بكات ئەوا لەگەڵ ئەو كەسانەدا دەبێت كە خوا نیعمەتی خۆی پێبەخشیوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاكان ، وە **ئەوانەش باشترین هاوڕێن** .

لە بەر گرنگی و بایەخی ئەم بابەتە دەبینین خوای گەورە فێری كردووین كەوا لە نوێژەكانماندا بە لایەنی كەمەوە ڕۆژانە حەڤدە (١٧) جار داوای لێبكەین هیدایەتمان بدات و ڕێنماییمان بكات بۆ سەر ڕێگای ئەوانەی نیعمەتی خۆیی پێبەخشیون كە باشترین هاوڕێن :

﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾﴾ [سورة الفاتحة] .

واتە : خوایە ڕێنماییمان بكە بۆ سەر ڕێگای ڕاست .. ڕێگای **ئەوانەی كە نیعمەتی خۆتت پێبەخشیون** ، نەك ئەوانەی كە لێیان تووڕە بوویت و نەك ئەوانەش كە گومڕا بوون[1] .

---

[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((المغضوب عليهم اليهود والضالين النصارى)) [سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٢٦٣)] .

هۆی تووڕە بوونی خوا لە جوولەکەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان زانستیان پێ بوو بەڵام کردەوەیان پێ نەدەکرد !

وە هۆی گومڕا بوونی گاورەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان کردەوەیان دەکرد بەڵام بە بێ زانست !

بەڵام ئەوانەی کە خوا نیعمەتی خۆیی پێبەخشیون لە (پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان) زانستی بە سوودیان پێ بووە و لە هەمان کاتدا کردەوەی چاکیشیان کردووە بەو زانستە بە سوودە ، بۆیە خوای گەورە ئەو ڕێزەی لێ ناون و فەرمانی بە ئێمەش کردووە کە داوای لێبکەین ڕێنماییمان بکات بۆ سەر ڕێگا ڕاستەکەی ئەوان بۆ ئەوەی ببین بە هاوڕێی ئەوان لە دونیا و قیامەتدا .

* یەکێك لە پێشەوایانی سەلەف (ابن شَوذَب) رەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (إنَّ مِنْ نعمةِ الله على الشابِّ إذا نَسَكَ أنْ يُؤاخيَ صاحب السُّنَّة يحملُهُ عليها)[٢].

واتە : بەڕاستی هەندێك لە نیعمەتەکانی خوا بە سەر گەنجەوە لە کاتێکدا پێدەگات ئەوەیە کە برادەرێتی کەسێك لە هەڵگرانی سوننەت بکات بۆ ئەوەی پەروەردەی بکات لە سەری .

---

واتە : ئەوانەی کە خوا لێیان تووڕە بووە بریتین لە جوولەکە ، وە ئەوانەی کە گومڕا بوون بریتین لە گاورەکان .

[٢] شرح أصول السنة للالكائي رقم : (٣١) .

* یەکێکی تر لە پێشەوایانی سەلەف (أیوب السختیاني) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (إنَّ مِنْ سَعادةِ الحَدَث والأعجميّ أنْ يُوفّقهما الله للعالِم بالسُّنة)[٣].

واتە : بەڕاستی بەختەوەری گەنج و کەسێك کە زمانی عەرەبی نەزانێت لەوەدایە کە خوا زانایەکی شارەزا بە سوننەتی بۆ ڕێکبخات کە تێیبگەیەنێت و پەروەردەی بکات لە سەری .

لەمەوە بۆمان ڕوون و ئاشکرا دەبێت کەوا هاوڕێیەتی کردنی شارەزایان بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنکەوتوانی ئەوانەی کە بەردەوام دالکۆکی دەکەن لە زیندوو کردنەوە و پەیڕەو کردنی سوننەتەکان کاریگەری بەرچاویان هەیە لە سەر ژیان و داهاتووی لاوان بۆیە زانایانی پێشین زۆر بایەخیان پێ داوە و جەختیان لە سەر کردووەتەوە ، چونکە بە هاوشێوەی ئەم جۆرە هاوڕێیەتی و برادەرێتیە خوای گەورە گومڕایان ڕزگار دەکات و هیدایەتی لاوێبووان دەدات بۆ سەر ڕێگای ڕاست کە بریتییە لە زانستی بە سوود و کردەوەی چاك .

---

[٣] شرح أصول السنة للالكائي رقم : (٣٠) .

## زانستی بە سوود و کردەوەی چاك پەیامی پێغەمبەرمانە (ﷺ)

خـــوای پـــەروەردگار فەرمووییـــەتی : ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ [سورة التوبة : ٣٣ ، وسورة الصف : ٩] .

هـەروەها فەرموویـەتی : ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ [سورة الفتح : ٢٨] .

واتە : خوای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی ناردووە بە (ڕێنمایی) و (دین داری ڕاستەقینە) بۆ ئەوەی لینەکەی سەرکەوێت بە سەر هەموو دین و ئاینـەکانی تـردا ئەگـەر چـی موشـریك و هاوەڵبڕیادەرەکانیش پێیان ناخۆش بێت ، وە خوالش بەسە بیێت بە شاهید .

ئیمامی (ابن كثیر) فەرموویەتی : (فَــالْهُدَى هو العلم النافع ، وَدِينِ الْحَقِّ هو العمل الصالــح)[٤] .

---

[٤] تفسير ابن كثير : (٤ / ١٧١) .

سوودێك : ئیمامی (ابن كـثیر) لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا : ﴿يَهۡدِىٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ [ســـورة الأحقـــاف] فەرموویـــەتی : (﴿يَهۡدِىٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ﴾ لـە بیروبـاوەڕ و هەواڵەکانـدا ، ﴿وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ لـە کردارەکانـدا ،

واتە : (ڕێنمایی) بریتییە لە : زانستی بە سوود (العلم النافع) ... (دین داری ڕاستەقینەش) بریتییە لە کردەوەی چاکە (العمل الصالح) .

هەروەها فەرموویەتی : (فالهُدَىٰ هو ماجاء به من الإخبارات الصادقة والإيمان الصحيح والعلم النافع ، وَدِينِ الْحَقِّ هو الأعمال الصالحة الصحيحة النافعة في الدنيا والآخرة)(*) .

واتە : (الهُدَىٰ / ڕێنمایی) بریتییە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە : لە هەواڵە ڕاستەکان و باوەڕی دروست و زانستی بە سوود ، (وَدِينِ الْحَقِّ / دین داری حەق و ڕاستەقینە) بریتییە لە کردەوە چاک و ڕاست و بە سوودەکان لە دونیا و دواڕۆژدا .

---

چونکە قورئان دوو شتی تێدایە : هەواڵ و داواکاری ، جا هەواڵەکانی ڕاستن و داواکاریەکانیشی دادپەروەرانەن ، هەروەك چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ .

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ ﴾ فالهُدَىٰ هو العلم النافع ، وَدِينِ الْحَقِّ هو العمل الصالح ، بە هەمان شێوە جنۆکەکانیش وتیان : (﴿يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ﴾ واتە : ڕێنمایی دەکات بۆ حەق (لە بیروباوەڕدا / في الاعتقادات) ، ﴿وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە : ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست (لە کردارەکاندا / في العمليات).

(*) تفسير ابن كثير : (٢ / ١٣٥) عند تفسير الآية (٣٣) من سورة التوبة .

وە هەروەها فەرموویەتی : (﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾ أي بالعلم النافع والعمل الصالح ، فإنّ الشريعة تشتمل على شيئين

علم وعمل ، فالعلم الشرعي صحيح ..

والعمل الشرعي مقبول)[٦].

واتە : مەبەست بە (﴿ٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾) بریتییە لە زانستی بە سود و کردەوەی چاك ، چونکە شەریعەتی ئیسلام دوو شتی لە خۆ گرتووە :

زانست و کردەوە ، جا زانستی شەرعی ڕاستە ..

وە تەنها کردەوەی شەرعیش وەردەگیرێت .

* شێخ (عبد الرحمن السعدي) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (صُحبَةُ الأخيار : توجب العلوم النافعة ، والأخلاق الفاضلة ، والأعمال الصالحة ، وصحبة الأشرار تـحرِمُ من ذلك أجمع)[٧].

واتە : هاوڕێیەتی کردنی چاکەکاران : زانستە بە سوودەکان و ڕەوشتە جوانەکان و کردارە چاکەکان مسۆگەر دەکات ، وە هاوڕێیەتی کردنی خراپەکاران لە هەموو ئەوانە بێبەش و مەحرومت دەکات .

---

[٦] تفسير ابن كثير : (٤ / ٢٠٤) عند تفسير الآية (٢٨) من سورة الفتح .

[٧] بهجة قلوب الأبرار ص : (٢٢٦) .

* لە کۆتاییدا دەڵێم :

ئایا پێت خۆشە لەگەڵ کام لەمانەدا بیت :

| | | |
|---|---|---|
| الرحمن | یان | الشيطان |
| أهل الإيـــمان | یان | أهل الكفر |
| أهل التوحيد | یان | أهل الشرك |
| أهل السنة | یان | أهل البدعة |
| أهل الطاعة | یان | أهل المعصية |
| الأبرار | یان | الفُجّار |
| أصحاب اليمين | یان | أصحاب الشّمال |
| أصحاب الــجنّة | یان | أصحاب النّار |

﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾﴾ [سورة الانفطار] .

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ
فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ﴿١٨٥﴾﴾ [سورة آل عمران] .

﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ
أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾﴾ [سورة الحشر] .

# لە بەرهەمەکانی وەرگێڕ

١ ـ سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان ـ چاپی چوارەم ـ .

٢ ـ بیروباوەڕت وەربگرە لە قورئان و سوننەت ـ چاپی نۆیەم ـ .

٣ ـ پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی ـ چاپی سێیەم ـ .

٤ ـ کورتەیەك لە فیقهی سوننەت و قورئانی ئازیز ، کە بریتییە لە وەرگێڕانی کتێبی : (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ـ ئامادە دەکرێت بۆ چاپ ـ .

٥ ـ برایەتی نێوان موسڵمانان .... ـ چاپی چوارەم ـ .

٦ ـ لە گەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟ ـ چاپی حەوتەم ـ .

٧ ـ چۆنێتی قوربانی کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی چوارەم ـ .

٨ ـ کاتی پارشێو و بەربانگ کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی سێیەم ـ .

٩ ـ حوکم و ئادابەکانی قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە ... چاپی یەکەم ـ .

١٠ ـ فەتوای گەورە زانایانی هاوچەرخی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە حوکمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچە پارچەگەرێتی ـ چاپی دووەم ـ .

١١ ـ گەڕانەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە پارێزەرە لە تیاچوون و گومڕابوون ـ چاپی یەکەم ـ .

١٢ ـ لە ئیسلامدا چەندین گروپ و حیزب نییە بە ... کۆمەڵی موسڵمانان و خەلیفە هەیە ـ چاپی یەکەم ـ .

١٣ ـ حوکمی کۆمەڵ و حزبە ئیسلامییەکان لە نێو کۆمەڵگای موسلمانانندا / فەتهای هەردوو شێخ : (ابن باز) و (ابن العثیمین) ـ چاپی یەکەم ـ .

١٤ ـ زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا :

یەکەم : ئافرەتان و فێربوونی زانستی شەرعی ـ چاپی پێنجەم ـ .

دووەم : زاناترین ئافرەتی دونیا ـ چاپی پێنجەم ـ .

سێیەم : لە دایک بوونی کچان و سەرهەڵدانەوەی خەسڵەتێکی سەردەمی نەفامی و جاهلی لە سەدەی پێشکەوتووی بیست و یەکدا !!! ـ چاپی پێنجەم ـ .

١٥ ـ ئایا ئەم دەرگایەت داوە ؟ (پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار) ـ چاپی سێیەم ـ .